مختصر
# العقيدة الصحيحة
من الكتاب و السنة

# كورتەی
# بیروباوەڕی ڕاست

## لە قورئان و فەرموودە ڕاستەکاندا


نوسینی
محمد جمیل زینو

وەرگێڕانی
یوسف رشید

پێداچوونەوەی
مامۆستا جمعە علی خورشید

# بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أنّ محمداً عبده ورسوله وبعد:

خوشك و برای موسوڵمان: ئەم نامیلکەیەی بەردەستان بریتـییە لە: ( بیرو باوەڕی ئیسلامی بە بەڵگەی قورئان و سوننەت) کە دانراوی زانای پایە بەرز: (محمد جميل زينو ) یە، جا منیش وام بە پێویست زانـی کە ئەم نامیلکەیە وەربگێڕمە سەر زمـانی کوردی تـاوەکو سود و قـازانجی گشتی بێت بۆ هـەمووان، چونکە بەڕاستی ئەم نامیلکەیە زۆر بابەتی گرنگی لەخۆ گرتووە لە بواری بیروباوەڕدا، کە پێویست و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك چ ئافرەت بێت یان پیاو بیانزانـێ، لەبەر ئـەوەی بەختـەوەری مرۆڤ لـە دونیـا و دواڕۆژدا پەیوەستە بە بیروباوەڕی ڕاست و دروستەوە، جا ئەم نامیلکەیەش بەشێکی زۆری لـە بیروبـاوەڕی ڕاسـت و پوخت لە خۆ گرتووە کە هیچ موسڵمانێك لێی بێ پێویست نابێت ئەگەر بەختەوەری خۆی بوێـت لـە دونیـا و قیامەتدا، جا داواکارم لە خوای گەورە سودی لێ وەربگرن و ببێتە جێگای ڕازی بوونی خـوای گـەورە پاشـان ئێوەی بەڕێز و خۆشەویست .

نوسینی: باوکی موسی

یوسف رشید محمود

# بسم الله الرحمن الرحيم

## بە ناوی خوای زۆر بەبەزەیی و میهرەبانەوە

ان الحمد لله نحمده ونستعينه و نستغفره،

هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خودایە سوپاسی دەكەین و داوای یارمەتی و لێخۆش بوونی لێ دەكەین،

من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له .

هەركەسێ خودا ڕێنمایی بكات كەس نی‌یە گومڕای بكات، وە هەركەسێك خودا گومڕای بكات كەس نی-یە ڕێنمایی بكات.

وأشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد أنَّ محمداً عبده و رسوله.

شایەتی دەدەم بەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیيە شایەنی پەرستن بێ جگە لە خودا تەنهایە و هاوبەشی نی یە، وەشایەتی دەدەم محمدﷺبەندەی خوایە و نێردراوی ئەوە.

أما بعد فهذه أسئلة هامة في العقيدة أُجيب عليها،

لە پاشان ئەمە چەند پرسیارێكی گرنگە دەربارەی بیروباوەڕ وەڵامی لەسەر دراوەتەوە،

مع ذكر الدليل من القران والحديث الصحيح،

لەگەڵ باس كردنی بەڵگە لە قورئان و فەرموودەی ڕاست،

ليطمئن القاريء الى صحة الجواب.

تاوەكوو خوێنەر دڵنیا بێت لە ڕاستی وەڵامەكە.

لأنَّ عقيدة التوحيد هى أساس سعادة الانسان في الدنيا والآخرة.

چونكە بیروباوەڕی یەكخواپەرستی بنچینەی بەختەوەری مرۆڤە لە دونیا و قیامەت.

والله أسال أن ينفع بها المسلمين. ويجعلها خالصة لوجهه الكريم .

داواكارم لە خودا سودبەخشی بكا بۆ موسڵمانان. وە تەنها لەبەر ڕەزاوەندی ئەو بێت.

محمد جميل زينو

# أركان الاسلام

## پایەکانی ئیسلام

س١ / جبريل يسأل: يا محمد أخبرني عن الاسلام؟

جبرائیل پرسیار دەکات: ئەی محمد ﷺ پێم ڕابگەیەنە ئیسلام چیيە؟

ج١ / فقال رسول الله ﷺ: الاسلام:

١ – أن تشهد أن لا اله الا الله (لامعبود بحق الا الله).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە:

شایەتی بدەی بە لا اله الا الله ( هیچ پەرستراوێکی حەق نی يە شایەنی پەرستن بێت جگە لە خودا ) .

وأنَّ محمداً رسول الله ( وأنَّ محمداً أرسله الله لتبليغ دينه ) .

وە شایەتی دەدەم محمدﷺ نێردراوی خودایە(خوای گەورە محمدی ناردووە بۆ ڕاگەیاندنی ئایینەکەی ).

٢- وتقيم الصلاة: (تؤديها بأركانها بأطمئنان وخشوع ) .

وە نوێژ ئەنجام بدەی: ( نوێژ ئەنجام بدەی بە پایەکانیيەوەو بەدڵ ئارامی و ملکەچیيەوە ) .

٣- وتؤتي الزكاة: ( اذا ملك المسلم ٨٥ غراماً ذهباً او مايعادلها من النقود يدفع منها ٢,٥ في المئة بعد سنة، وغير النقود لها مقدار معين ).

وە زەکاتی ماڵەکەت بدەی: ( ئەگەر موسڵمان ٨٥ گرام ئاڵتونی هەبوو یان بە ئەندازەی ئاڵتونەکە پارەی هەبوو لە سەد دینار دوو دینار و نیو دەردەکات لە دوای هەموو ساڵێك، جگە لە پارەش (وەکو گەنم و جۆ و.......) ئەندازەی دیاری کراوی خۆی هەیە .

٤- وتصوم رمضان: ( تمتنع عن الطعام والشراب والجماع والمحرمات من الفجر حتى الغروب ) .

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگری: ( خۆت بگریتەوە لە خواردن و خواردنەوە و جیماع و هەموو حەرامێك لە بەیانی یەوە تا ئێوارە)

٥-وتحج البيت ان اسطتعت اليه سبيلا[1] .

وە سەردانی ماڵی خودا بکەی (بۆ حەج کردن) ئەگەر توانای ڕێکردن و مادی و هێمنی و ئاسایش هەبوو .

---

[1] – (رواه مسلم).

# أركان الايمان

## پایەکانی باوەڕ

س١ / قال جبريل: فأخبرني عن الايمان؟

جبرائیل فەرمووی: پێم ڕابگەیەنە باوەڕ چی‌یە؟

ج ١ / فقال رسول الله ﷺ: الايمان؟

١ – أن تؤمن بالله: (الاعتقاد بأن الله خالق ومعبود بالحق له أسماء وصفات ) . ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[2]

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باوەڕ بریتی‌یە لە

١- باوەڕ بوون بە خودا: ( باوەڕ بوون بەوەی کە خوای گەورە بەدیهێنەر و پەرستراوی بە حەقە چەندین ناو و سیفاتی بەرزی هەیە)،

خوای گەورە دەفەرمێت ( هیچ شتێك وەکو خودا نی‌یە، وە خودا بیسەر و بینایە ) ( الشوری )

٢ – والملائكة: ( مخلوقات من نور لتنفيذ أوامر الله لانراهم ).

٢- باوەڕ بوون بە فریشتەکان: ( دروست کراون لە ڕووناکی بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا، ئێمە نایان بینین ) .

٣- وكتبه: ( التوراة والانجيل والزبور والقران ناسخها ).

٣- باوەڕ بوون بە کتێبەکانی خودا: ( تەورات و ئینجیل و زەبوور و قورئان کە ئەوانەی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە و سڕیوەتەوە ) .

٤- ورسله: (أولهم نوح .. .. .. وآخرهم محمد ﷺ ) .

٤- باوەڕ بوون بە پێغەمبەرانی خودا (یەکەمیان نوحە ﷺ... وەکۆتایی‌یەکەیان محمدە ﷺ ) .

٥- واليوم الآخر: ( يوم القيامة لمحاسبة الناس ) .

٥- باوەڕ بوون بە ڕۆژی کۆتایی: (ڕۆژی قیامەت بۆ لێپرسینەوەی خەڵکی).

٦- وتؤمن بالقدر خيره وشره ( الرضا بما قدره الله مع الأخذ بالأسباب )[3] .

٦- باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەر بەخێر وشەری یەوە (ڕازی بوون بە قەزاو قەدەری خوا لەگەڵ دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە ) .

---

2 - ( الشورى / ١١).

3 - (رواه مسلم) .

# حق الله على العباد

## مافی خوا بەسەر بەندەکانەوە

س١ / لماذا خلقنا الله؟

بۆچی خوا ئێمەی دروست کردووە ؟

ج١ / خلقنا الله لنعبده ولا نشرك به شيئا .

خوا ئێمەی دروست کردووە بۆ ئەوەی بیپەرستین و هیچ شتێك نەكەین بەهاوبەشی .

والدليل قول الله تعالى: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[4] .

واتە: جنۆکە ومرۆڤم دروست نەکردووە بۆ هیچ مەبەستێك تەنها پەرستنی خۆم نەبێت .

وقوله صلى الله عليه وسلم: ( حق الله على العباد أن يعبدوه ولا يشركوا به شيئا )[5].

واتە: (مافی خوا بەسەر بەندەکانەوە ئەوەیە بیپەرستین وهیچ شتێك نەكەین بەهاوبەشی ) .

س٢ / ما هي العبادة؟

پەرستن چىيە ؟

ج٢ / العبادة: اسم جامع لما يحبه الله من الأقوال والأفعال: كالدعاء والصلاة والخشوع وغيرها .

پەرستن: ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی خوا پێی خۆشە لەووتەو کردەوە: وەکو پاڕانەوە ونوێژ و ملکەچی و جگە لەمانەش .

قال الله تعالى: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[6]. ( نسكي: ذبحي للحيوانات).

واتە: ئەی موحەممەدﷺ پێیان بڵێ نوێژ کردن و حەیوان سەربڕین وژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانە . ( نسکی: حەیوان سەربڕینم )

وقال صلى الله عليه وسلم: قال الله تعالى: ﴿ وما تقرب اليَّ عبدي بشي أحب اليَّ مما افترضته عليه ﴾[7].

واتە: نزیك نابێتەوە لەمن هیچ بەندەیەکی من بەشتێك خۆشەویس تر بێت لای من وەك لەو شتانەی فەرزم کردووە لەسەری .

واتە: بەندەکان بەفەرزەکان زیاتر نزیك دەبنەوە لەخوای گەورە وەك لە سوننەتەکان .

س٣ / كيف نعبد الله؟

چۆن خوای گەورە بپەرستین؟

ج٣ / كما أمرنا ورسوله،

هەروەکو چۆن خوا و پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێ کردوین،

قال الله تعالى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ ﴾[8] .

---

4 - ( الذاريات /٥٦).

5 - ( متفق عليه).

6 - (الأنعام /١٦٢).

7 - (حديث قدسي رواه البخاري).

8 - (محمد /٣٣).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕوادارن گوێڕایەڵی خوا بکەن وگوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن وکردەوەکانتان پوچەڵ مەکەنەوە بەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ .

وقال صلى الله عليه وسلم: ( من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد )[9] .

( أي غير مقبول ) .

واتە: هەرکەسێك کردارێك بکات ئەو کردارە فەرمانی ئێمەی ( خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ) لەسەر نەبێت ئەوا بەرپەرچ دەدرێتەوە .

( واتە: وەرناگیرێت ) .

س٤ / هل نعبد الله خوفاً وطمعاً؟

ئایا خوای گەورە بپەرستین لە ترسی دۆزەخ و بەتەماعی بەهەشت؟

ج٤ / نعم نعبده كذلك، قال الله تعالى آمراً عباده:

بەڵێ بەو شیوەیە دەیپەرستین، خوا فەرمان دەکات بەبەندەکانی و دەفەرمێت: ﴿ وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾[10] .

واتە: خوای گەورە بپەرستن لە ترسی دۆزەخ و بەتەماعی بەهەشت .

وقالﷺ: (أسأل الله الجنة وأعوذ به من النار)[11] .

واتە: داوای بەهەشت دەکەم لەخوا، وەپەنای پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ .

س٥ / ما هو الاحسان في العبادة؟

چاکە چی‌یە لە پەرستندا؟

ج٥ / الاحسان هو مرا قبة الله تعالى في العبادة .

چاکە لە پەرستندا بریتی‌یە لە چاودێری کردنی خوا لە پەرستندا، واتە بزانی کە خوای گەورە چاودێرە بەسەر ئەوە .

قال الله تعالى: ﴿ الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ ﴾[12] .

واتە: ئەو خودایەی دەتبینێت کاتێك هەڵدەستیت بۆ شەونوێژ وە کاتێك کە سوژدە دەبەی لەگەڵ سوژدەبەراندا .

وقالﷺ: ( الاحسان أن تعبد الله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك )[13] .

واتە: چاکە لەپەرستندا ئەوەیە خوای گەورە بپەرستیت وەك ئەوەی کەدەیبینی ئەگەر تۆش ئەو نابینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێ .

س٦ / ماهى أنواع العبادة؟

جۆرەکانی پەرستن چین؟

ج٦ / أنواع العبادة كثيرة منها:

---

9 - (رواه مسلم) .

10 - ( الأعراف / ٥٦).

11 - (رواه أبو داود بسند صحيح) .

12 - (الشعراء / ٢١٨-٢١٩).

13 - (رواه مسلم) .

الدعاء، والخوف، والرجاء، والتوكل، والرغبة والرهبة، والذبح والنذر، والصوم والركوع والسجود، والطواف، والحلف، والحكم، وغير ذالك من أنواع العبادة المشروعة .

جۆرەکانی پەرستن زۆرن لەوانە:

پاڕانەوە، ترسان لەخوا، بە هیوا بوونی ڕەحمەتی خوا، پشت بەستن بەخوا، مەوڵدان بۆ بەهەشت و ترسان لە دۆزەخ، قوربانی کردن، پەیمان بەستن (نذر)، ڕۆژوو گرتن و کوڕنوش بردن و سوژدە بردن، سوڕانەوە بەدەور کەعبەدا، سوێند خواردن، یاسا دانان، جگە لەمانەش لە جۆرەکانی پەرستن کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتبێ .

# أنواع التوحيد وفوائده

## جۆرەکانی بەتاك دانانی خوای گەورە وسودەکانی

س١/ لماذا أرسل الله الرسل؟

بۆچی خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە؟

ج١/ أرسلهم للدعوة الى عبادته، ونفي الشريك عن الله .

خوای گەورە ناردوونی بۆ بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ پەرستنی خوای گەورە، ونەهێشتنی هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە.خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[14].

واتە/ بەڕاستی ئێمە بۆ هەموو ئومەتێك پێغەمبەرێكمان ناردووە، ئەوانیش بە ئومەتەکەی خۆیان ووتوە: خوای گەورە بپەرستن بەتەنها، و وازبهێنن لە پەرستنی تاغوت.

(الطاغوت الذي يعبده الناس، ويدعونه من دون الله وهو راض بذلك).

(تاغوت: بریتی‌یە لەو پەرستراوانەی کە خەڵكی دەیانپەرستن لەجگە لەخوای گەورە، ئەوانیش ڕازین بەو پەرستنە .)

وقال ﷺ: (الأنبياء اخوة من علات وأمهاتهم شتى ودينهم واحد)[15].

واتە/ پێغەمبەران بران لە باکەوە، ودایکیان جیاوازە، ئاین وبیروباوەڕیان یەکە.

المعنى: أصل ايمانهم واحد، وشرائعهم مختلفة، فانهم متفقون في أصول التوحيد، وأما فروع الشرائع فوقع فيها الاختلاف.

واتە/ بنچینەی بیروباوەڕیان یەکە، بەڵام شەریعەتەکانیان جیاوازە، پێغەمبەران هەموویان یەکن لەسەر بنچینەی یەکخواپەرستی، بەڵام لەبەشەکانی تری شەریعەتدا جیاوازی تێدا هەیە.

س٢/ ماهو توحيد الرب؟

بەتاك دانانی خوای گەورە لە پەروەردگارێتی دا چی‌یە؟

ج٢/ هو افراده بأفعاله كالخلق والتدبير وغيرهما...

بریتی‌یە لە بەتەنها زانینی خوای گەورە لە کردەوەکانی دا وەکو: دروست کردن وبەڕێوەبردن وجگە لەمانە...

قال الله تعالى: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[16].

---

14 - (النحل / ٣٦).

15 - ( متفق عليه).

واتە: سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانە.

وقالﷺ: (اللهم لك الحمد أنت رب السماوات والأرض)[١٧].

واتە/ ئەی پەروەردگار سوپاس وستایش بۆ تۆ، هەر تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان وزەویت.

س٣/ ماهو توحيد الإله؟

بەتاك دانانی خوای گەورە لە پەرستندا چی‌یە؟

ج٣/ هو افراده بالعبادة كالدعاء والذبح والنذر والصلاة والرجاء الخوف والاستعانة والتوكل وغيرها.

بریتی‌یە لە بەتەنها زانینی خوای گەورە لە پەرستندا وەکو پاڕانەوە وسەربڕین وپەیمان بەستن ونوێژکردن وبەهیوا بوونی خوا وترسان لێی وداوای یارمەتی کردن لێی وپشت بەستن پێی وجگە لەمانە.

قال الله تعالى: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾[١٨].

واتە/ پەرستراوی ئێوە تەنها یەکە ئەویش خوای گەورەیە، هیچ پەرستراوێکی تری حەق نی‌یە کە شایانی پەرستن بێت جگە لەو، کەزۆر بە سۆز وبەزەیی‌یە.

وقالﷺ: ( فليكن أول ما تدعوهم اليه شهادة أن لا اله الا الله)[١٩].

وفي رواية البخاري: (الى أن يوحدوا الله).

واتە/ یەکەم شت کە بانگەوازی بۆ دەکەیت با بریتی بێت لە شایەتی دان بەوەی هیچ پەرستراوێکی حەق نی‌یە شایانی پەرستن بێت جگە لەخوای گەورە.

وەلە ڕیوایەتی ئیمامی بوخاریدا: با بانگەوازت بۆ بەتاك دانانی خوای گەورە بێت.

س٤/ ما معنى لا اله الا الله؟

مانای لا اله الا الله چی‌یە؟

ج٤/ معناها: لا معبود بحق الا الله.

مانای ئەوەیە: هیچ پەرستراوێك نی‌یە کە شایانی پەرستن بێت بە حەق جگە لە خوای گەورە.

قال الله تعالى: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ﴾[٢٠].

واتە/ ئەوەی کە باس کرا بۆتان(لەئایەتی پێشودا)دەری دەخات کەتەنها پەرستنی خودا ڕاستە ودروستە، وەهەر پەرستنێك کە بۆ جگە لە خوای گەورە ئەنجام بدرێت بەتاڵەو هیچ سودی نی‌یە.

وقالﷺ: ( من قال لا اله الا الله وكفر بما يعبد من دون الله، حرم دمه وماله)[٢١].

واتە/ هەرکەسێك بڵێت هیچ پەرستراوێکی حەق نی‌یە کە شایانی پەرستن بێ جگە لە خوای گەورە، وە بێ باوەڕ بێت بەوانەی کە جگە لەخوای گەورە دەپەرسترێن، ئەوا خوێن ومالی حەرام دەبێت لەسەر موسڵمانان.

س٥/ ماهو توحيد صفات الله وأسمائه؟

---

16 – ( الفاتحة / ١).

17 – ( متفق عليه).

18 – (البقرة / ١٦٣).

19 – ( متفق عليه).

20 – ( الحج / ٦٢).

21 – (رواه مسلم).

بەتاك دانانی خوای گەورە لەناوو سیفەتەکانی‌دا چی‌یە؟

ج٥/ هو اثبات ما وصف الله به نفسه في كتابه أو وصفه رسولهﷺ في أحاديثه الصحيحة على الحقيقة، بلا تأويل، ولاتجسيم، ولا تمثيل، ولاتعطيل، ولا تكيف، كالاستواء والنزول واليد وغيرها،مما يليق بكمال الله.

بریتی‌یە لەدان نان وجێگیرکردنی ئەو ناوو سیفاتانەی کە خوای گەورە وەسفی خۆی پێکردووە لەقورئانەکەیدا، یاخود پێغەمبەری خواﷺ وەسفی کردووە لەفەرموودە ڕاستەکانیدا، بەبێ ئەوەی ماناکەی بگۆڕی، یاخودلاشەی بۆ دابنێیت، یاخود بیچوێنیت بەسیفاتی دروست کراوەکانی، یاخود داپڕنی لەسیفاتەکانی، یاخود چۆنێتی بۆ دابنێیت، وەکو بەرز بوونەوەی خوای گەورە بۆ سەر عەرشەکەی، ودابەزینی بۆ ئاسمانی دونیا، ودەستی خوای گەورە وجگە لەمانە، بەشێوەیەك کە شیاوو گونجاو بێت بە تەواوێتی خوای گەورەوە.

قال الله تعالى: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[22].

واتە/ هیچ شتێك لەخوای گەورە ناچێت(نەلەخودی خۆیدا، وەنەلەناوو سیفاتەکانیدا) وەخوای گەورە بیسەرەو بینایە.

وقالﷺ: (ينزل ربنا في كل ليلة الى سماء الدنيا)[23].

واتە/ هەموو شەوێك خوای گەورە دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا.

(ينزل نزولا يليق بجلاله، ولا يشبه أحد من مخلوقاته).

خوای گەورە دادەبەزێت دەبەزینێك تەنها شایانی گەورەیی خۆیەتی، لەدابەزینی هیچ کەسێك لە دروست کراوەکانی ناچێت.

س٦/ أين الله؟

خوای گەورە لەکوێیە؟

ج٦/ الله فوق العرش على السماء.

خوای گەور لەسەر عەرشە لەسەروی هەموو ئاسمانەکانەوە.

قال الله تعالى: ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾[24].

(أي علا وارتفع)(كما جاء في البخاري عن التابعين).

واتە/ خوای گەورە بەرزو بڵندە لەسەر عەرشی خۆیەتی.

استوى: واتە/ بەرزو بڵندە(لە صحیح البخاری) دا هاتووە لە تابیعینەوە.

وقالﷺ: (ان الله كتب كتابا قبل أن يخلق الخلق...فهو مكتوب عنده فوق العرش)[25].

واتە/ خوای گەورە نوسراوێکی نوسیوە پێش ئەوەی دروست کراوەکان دروست بکات...ئەو نوسراوە لای خۆیەتی لەسەروی عەرشەوە.

س٧/ هل الله معنا؟

---

22 - (الشورى / ١١).

23 - (صحيح رواه أحمد).

24 - (طه / ٥).

25 - (رواه البخاري).

ئایا خوای گەورە لەگەڵماندایە؟

ج٧/ الله معنا بعلمه يسمعنا ويرانا.

خوای گەورە لەگەڵماندایە بەزانیاری خۆی و، وتەکانمان دەبیستێت ودەمان بینێت.

قال الله تعالى: ﴿ قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾[26].

واتە/ خوای گەورە بە موساو هارونی فەرموو: لە فیرعەون مەترسن چونکە من لەگەڵتانم، دەبیستم ودەبینم.

وقالﷺ: ( انكم تدعون سميعا قريبا وهو معكم)[27] (بعلمه يسمعكم ويراكم).

واتە/ ئێوە داوا لەخوایەك دەكەن كەدەبیستێت ونزیکە لێتانەوە ولەگەڵتاندایە.(لەگەڵتانتدایە بەزانیاری خۆی، وتەکانتان دەبیستێت ودەتان بینێت).

س٨/ ما هي فائدة التوحيد؟

سودی بەتاك دانانی خوای گەورە چی‌یە؟

ج٨/ فائدة التوحيد هي الأمن في الآخرة من العذاب المؤبد، والهداية في الدنيا، وتكفير الذنوب.

سودی بەتاك دانانی خوای گەورە ئەوەیە کە ئەمین دەبیت لە سزای هەمیشەیی لەدوا ڕۆژدا، وەدەبێتە هۆی ڕێنمایی بۆت لەدونیادا، وەدەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان.

قال الله تعالى: ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾[28].

واتە/ ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە وهاوبەش دانانیان تێکەڵ بیروباوەڕەکەیان نەکردووە، ئەوانە ئەمینن لەسزای خوای گەورە لەڕۆژی دوایی دا، وەڕێنمایی کراون لەدونیادا.(بظلم: واتە/ هاوبەش دانان).

وقالﷺ: (حق العباد على الله أن لا يعذب من لا يشرك به شيئا)[29].

واتە/ مافی بەندەکان لای خوای گەورە ئەوەیە کە سزای ئەو کەسانە نەدات کە هاوبەشی بۆ بڕیار نادەن.

26- (طه / ٤٦).
27 - (رواه مسلم).
28 - (الأنعام / ٨٢ ).
29 - ( متفق عليه).

# شروط قبول العمل

## مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە

س١/ ماهي شروط قبول العمل؟

مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە چیە؟

ج١/ شروط قبول العمل عند الله ثلاثة:

مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە لای خوای گەورە سیانە:

١-الایمان بالله وتوحیده،

بڕوا بوون بەخوای گەورەو بەتاك دانانی خوای گەورە،

قال الله تعالى: ﴿ وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا﴾[٣٠].

واتە/ خوای گەورە لەبارەی بێ باوەڕەکانەوە دەفەرمێت: ئەو کردەوە چاکانەی کە کردبویان لە دونیادا، لەڕۆژی قیامەتدا دەیهێنینەوە پێش چاویان، لەپاشاندا وەکو تۆزێکی با بردووی لێ دەکەین، واتە/ لێیان وەرناگرین چونکە بێ باوەڕبوونە.

وقال ﷺ: (قل آمنت بالله، ثم استقم)[٣١].

واتە/ بڵێ باوەڕم هێناوە بەخوای گەورە، پاشان بەردەوام ودامەزراو بە لەسەر ئەو باوەڕە.

ومن شروط الایمان أن لا ینقض صاحب العمل ایمانه بكفر أو شرك بأن یصرف شیئا من العبادة لغیر الله، كـدعاء الأنبیـاء والأموات والاستعانة بهم.

وە هەندێك لە مەرجەکانی باوەڕ ئەوەیە کە خاوەنی ئەو کردەوەیە باوەڕەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە بە بێ باوەڕی یاخود بە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە بەئەنجام دانی هەندێك پەرستن بۆ جگە لە خوای گەورە، وەکو پاڕانەوە لە پێغەمبەران ومردووەکان وداوای یارمەتی کردن لێیان.

أ- قال الله تعالى: ﴿ وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٣٢].

واتە/ ئەگەر هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدەن ئەوا هەر کردەوەیەکی باشیان هەبێت هەڵدەوەشێتەوە و وەرناگیرێت.

ب- وقال تعالى: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[٣٣].

واتە/ ئەی موحەمەدﷺ سروشمان بۆ تۆو پێغەمبەرانی پێش تۆیش ناردووە کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت ئەوا کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە و دەبیت لەو کەسانەی کە زەرەر مەندن.

٢- الاخلاص: وهو العمل لله من غیر ریاء ولا سمعة،

دڵسۆزی ونیەت پاکی: ئەویش بەوە دەبێت ئەو کردەوەیە تەنها لەبەر خوا ئەنجام بدرێت، نەك بۆ بینین وبیستنی خەڵکی،

---

30 - (الفرقان / ٢٣).

31 - (رواه مسلم).

32 - (الأنعام /٨٨).

33 - (الزمر /٦٥).

قال الله تعالى: ﴿ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾[34].

واتە/ بپاڕێنەوە لە خوداو دڵسۆز بن لەپەرستنی دا.

وقالﷺ: (من قال لا اله الا الله مخلصا دخل الجنة)[35].

واتە/ هەرکەسێك بە دڵسۆزییەوە بڵێت هیچ پەرستراوێکی حەق نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

٣- الموافقة لما جاء به الرسولﷺ:

کردەوەکە بە گوێرەی ئەو بەرنامەیە بێت کە پێغەمبەری خواﷺ پیێ هاتووە: (واتە/ قورئان وسوننەت).

قال الله تعالى: ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾[36].

واتە/ هەرچییەك كە پێغەمبەری خوا بۆی هێناون وفەرمانی پێ كردون ئێوە وەری بگرن، وەهەرچیشی لێ قەدەغەکردن ئەوا لێی دور بکەونەوە.

وقالﷺ: (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)[37]. (أي غير مقبول).

واتە/ هەرکەسێك هەرکردەوەیەك بکات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت ورەد دەکرێتەوە(واتە/ وەرناگیرێت).

## الشرك الأكبر وأنواعه

### هاوبەش دانانی گەورەو جۆرەکانی

س١/ ماهو الشرك الأكبر؟

هاوبەش دانانی گەورە چییە؟

ج١/ الشرك الأكبر هو صرف نوع من أنواع العبادة لغير الله كالدعاء والذبح وغير ذلك،

هاوبەش دانانی گەورە بریتییە لە ئەنجام دانی جۆرێك لەجۆرەکانی پەرستن بۆ جگە لە خوای گەورە وەکو پاڕانەوەو سەربڕین وجگە لەمانە،

والدليل قول الله تعالى: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾[38].

واتە/ مەپاڕێرەوە لە جگە لەخوای گەورە لەشتێك كە سود وزیانیان بۆت نییە، ئەگەر پاڕایتەوە لەجگە لەخوای گەورە ئەوا دەبیت بە یەکێك لە هاوبەش پەیداکەرەکان.

وقولهﷺ: (أكبر الكبائر: الاشراك بالله، وعقوق الوالدين، وشهادة الزور)[39].

34 - (غافر / ٦٥).
35 - (صحيح رواه البزار وغيره.).
36 - (الحشر / ٧).
37 - (رواه مسلم).
38 - (يونس / ١٠٦).
39 - (رواه مسلم).

واتە/ گەورەترینی تاوانە گەورەکان بریتی‌یە لە: هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، وئازاردانی دایك وباوك، وشایەتی دانی درۆ.

س٢/ ما هو أعظم الذنوب عند الله؟

گەورەترین تاوان لای خوای گەورە چی‌یە؟

ج٢/ أعظم الذنوب عند الله الشرك الأكبر،

گەورەترین تاوان لای خوای گەورە بریتی‌یە لە هاوبەش دانانی گەورە،

والدليل قوله تعالى: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[40].

واتە/ لوقمان بە کوڕەکەی فەرموو: ئەی کوڕی خۆشەویستم هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەیت، چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە گەورەترین ستەمە.

سئل رسول الله ﷺ: أي الذنب أكبر عند الله؟ قال: (أن تدعو لله ندا وهو خلقك)[41].

واتە/ پرسیار کرا لەپێغەمبەری خواﷺ: کام تاوان لەهەموو تاوانەکان گەورەترە لای خوای گەورە؟

پێغەمبەریشﷺ لەوەڵامدا فەرمووی: هاوبەش دابنێیت بۆ خوای گەورە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو دروستی کردوویت.

(الند: واتە/ هاوبەش دانان).

س٣/ هل الشرك موجود في هذه الأمة؟

ئایا هاوبەش دانان هەیە لەناو ئەم خەڵکەدا؟

ج٣/ نعم موجود، والدليل قول الله تعالى: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾[42].

بەڵێ هەیە، بەڵگەیش خوای گەورە دەفەرمێت: زۆربەی خەڵکی هەرچەندە بڕوایان هەیە کە خوای گەورە دروست کەرو ڕۆزی دەرە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیاردەدەن.

وقالﷺ: (لاتقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد الأوثان)[43].

واتە/ قیامەت هەڵناسێت هەتا کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم پەیوەندی نەکەن بە هاوبەش بڕیاردەرەکانەوە، وەهەتا دەست نەکرێت بەبت پەرستی.

س٤/ ما حكم دعاء الأموات أوالغائبين؟

حوکمی پاڕانەوە لە مردوو ئەو کەسانەی ئامادە نین چی‌یە؟

ج٤/ دعائهم من الشرك الأكبر،

پاڕانەوە لێیان هاوبەش دانانی گەورەیە،

قال الله تعالى: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ﴾[44].

---

40 - (لقمان / ١٣).

41 - (رواه البخاري).

42 - (يوسف / ١٠٦).

43 - (صحيح رواه الترمذي).

44 - (الشعراء / ٢١٣).

واتە/ لەگەڵ خوای گەورەدا خوایەکی تر دامەنێ لێی بپاڕێیتەوە چونکە ئەگەر وات کرد ئەوا لەو کەسانە دەبیت کەبەئاگری دۆزەخ سزا دەدرێن.

وقال ﷺ: ( من مات وهو يدعو من دون الله ندا دخل النار)[45].

واتە/ هەر کەسێك مردبێت وپاڕابێتەوە لە جگە لە خوای گەورە ئەوا دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

(الند: هاوبەش دانان).

س٥/ هل الدعاء عبادة؟

ئایا پاڕانەوە پەرستنە؟

ج٥/ نعم الدعاء عبادة،

بەڵێ پاڕانەوە پەرستنە،

قال الله تعالى: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[46].

(عبادتي: دعائي).

واتە/ پەروەردگارتان فەرموویەتی لێم بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە، وەئەو کەسانەی کە لوت بەرزی دەکەن لەپاڕانەوە لەمن لەمەو دوا دەخرێنە دۆزەخەوە بەسەرشۆڕی.

(عبادتی: پاڕانەوە لەمن).

وقال ﷺ: ( الدعاء هو العبادة)[47].

واتە/ پاڕانەوە خۆی بۆ خۆی پەرستنە.

س٦/ هل يسمع الأموات الدعاء؟

ئایا مردووەکان پاڕانەوە دەبیستن؟

ج٦/ لا يسمعون الدعاء،

پاڕانەوە نابیستن،

١- قال الله تعالى: ﴿ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾[48].

واتە/ تۆ ناتوانی ئەی موحەمەدﷺ گوێ بیستی ئەو کەسانە بکەیت کە لەناو گۆڕەکاندان.

٢- وقف النبي ﷺ على قليب بدر فقال: ( هل وجدتم ما وعد ربكم حقاً؟) ثم قال: ( انهم الآن يسمعون ما أقول) فذُكر لعائشة فقالت: ( انما قال النبي انهم الآن ليعلمون، أن ماكنت أقول لهم هو الحق).

ثم قرأت: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾[49].

وقال قتادة راوي الحديث: (أحياهم الله حتى أسمعهم قوله توبيخاً وتصغيراً، ونقمةً وحسرةً وندامةً)[50].

45 - (رواه البخاري).

46 - (غافر / ٦٠).

47 - (رواه الترمذي وقال حسن صحيح).

48 - (فاطر / ٢٢).

49 - (النمل / ٨٠).

50 - (رواه البخاري في كتاب المغازي باب ٨ ).

واتە/ پێغەمبەری خواﷺ لەسەر بیرەکەی بەدر(قلیب) راوەستا وبەکافرە کوژراوەکانی فەرموو: ( ئایا ئەو بەڵێنەی کە خوای گەورە پێی دابوون بینیتان؟) پاشان فەرمووی: ( ئەوان ئێستا گوێیان لێیە کەمن چی دەڵێم).

ئەم فەرموودەیە بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداران باس کرا ئەویش فەرمووی: ( ئەوان ئێستا دەزانن کە ئەوەی من پێیان دەڵێم حەقە). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿ إِنَّكَ لا تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾.

واتە/ ئەی موحەمەدﷺ تۆ ناتوانیت گوێ بیستی مردوو بکەیت.

قەتادە کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە دەفەرمێت:( خوای گەورە زیندوی کردنەوە تاوەکو قسەکانی پێغەمبەری خواﷺ ببیستن بۆ سەرزەنشت کردن و بێ ڕێزی و سزاو پەشیمانی بۆیان ).

## يستفاد من الحديث

### ئەم سودانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت

١- ان سماع قتلى المشركين مؤقت بدليل قوله: ( انهم الآن يسمعون)، ومفهومه بعد الآن لا يسمعون، لأنه كما قال قتادة راوي الحديث: أحياهم الله حتى أسمعهم قوله توبيخاً وتصغيراً.

بیستنی کوژراوی هاوبەش پەیداکەرەکان بۆ کاتێکی دیاری کراو بوو، بەبەڵگەی فەرموودەکە کە دەفەرمێت: ( ئەوان ئێستا دەبیستن)، تێگەیشتن لە فەرموودەکە ئەوەیە کە دوای ئێستا نابیستن، لەبەر ئەوەی هەروەکو قەتادە کە خۆی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە دەفەرمێت( خوای گەورە زیندوویانی کردەوە تاوەکو قسەکانی پێغەمبەرﷺ ببیستن بۆ سەرزەنشت کردن وبێ ڕێزیان.

١- انكار عائشة لرواية ابن عمر وأن النبي لم يقل: ( يسمعون)، بل قال: (انهم الآن يعلمون)، مستدلة بالآية:

بەرهەڵستی کردنی عائیشەی دایکی باوەڕداران بۆ ڕیوایەتەکەی عبدالله ی کوڕی عومەر، وە پێغەمبەری خواﷺ نەیفەرمووە:( ئەبیستن) بەڵکو فەرموویەتی: (ئەوان ئێستا دەزانن)، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾[51].

واتە/ تۆ ناتوانی گوێ بیستی مردوو بکەیت.

٢- ويمكن التوفيق بين رواية ابن عمر وعائشة بما يلي:

ان الأصل هو عدم سماع الموتى، كما صرح به القرآن، ولكن الله أحيا قتلى المشركين معجزة للرسولﷺ حتى سمعوا كما صرح بذلك قتادة راوي الحديث، والله أعلم.

دەتوانرێت نێوان ڕیوایەتەکەی ئیبن عومەر وعائیشە بەم شێوەیە ڕێك بخرێت: ئەصڵ وبنچینە وایە کە مردوو نابیستێت، هەروەکو چۆن قورئان بەڕاشکاوی باسی کردووە، بەڵام خوای گەورە کوژراوی هاوبەش پەیدا کەرەکانی زیندوو کردەوە وەکو موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەرﷺ تاوەکو گوێیان لە قسەکانی بێت هەروەکو چۆن قەتادە بەڕاشکاوی باسی کرد، والله اعلم.

[51] - (النمل / ٨٠).

# أنواع الشرك الأكبر

## جۆرەکانی هاوبەش بڕیار دانی گەورە

س١/ هل نستغيث بالأموات أو الغائبين؟

ئایا دروستە داوای فریاکەوتن بکەین لە مردووەکان وئەوانەی ئامادە نین ولێمان دیار نین؟

ج١/ لا نستغيث هم بل نستغيث بالله.

داوای فریاکەوتنیان لێ ناکەین بەڵکو داوای فریاکەوتن تەنها لە خوای گەورە دەکەین.

قال الله تعالى: ١- ﴿ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾[52].

واتە/ ئەوانەی هاوار دەکەن لە کەسانێك جگە لە خوای گەورە هیچ شتێکیان دروست نەکردووە بەڵکو خۆیان دروست کراون، وە ئەوان مردوون و زیندوو نین، وە هیچ هەست وهۆشێکیان نییە هەتا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە.

٢- ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ ﴾[53].

واتە/ کاتێك داوای فریاکەوتنتان کرد لە پەروەردگارتان ئەویش وەڵامتانی دایەوە.

٣- وقال ﷺ: (يا حيُّ يا قيوم برحمتك أستغيث)[54].

واتە/ ئەی ئەو خودایەی کە هەمیشە زیندوویت و بەڕێوەبەری کاروباری بوونەوەریت، بەڕەحم وبەزەیی خۆت داوای فریاگوزاریت لێ دەکەم.

س٢/ هل تجوز الاستعانة بغير الله؟

ئایا دروستە داوای یارمەتی کردن لە جگە لە خوای گەورە؟

ج٢/ لا تجوز، والدليل قول الله تعالى: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾[55].

نەخێر دروست نییە، بەڵکەیش خوای گەورە دەفەرمێت: خودایە ئێمە بە تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین.

وقوله ﷺ: ( اذا سألت فاسأل الله، واذا استعنت فاستعن بالله)[56].

واتە/ ئەگەر داوات کرد تەنها داوا لە خوا بکە، وەئەگەر داوای یارمەتیت کرد تەنها داوا لەخوا بکە.

س٣/ هل نستعين بالأحياء؟

ئایا داوای یارمەتی لەزیندووەکان بکەین؟

ج٣/ نعم فيما يقدرون عليه،

بەڵێ لەو شتانەی کە توانایان هەیە بەسەریدا،

52 - (النحل / ٢٠-٢١).

53 - (الأنفال / ٩).

54 - (حسن رواه الترمذي).

55 - (الفاتحة / ٥).

56 - (رواه الترمذي وقال حسن صحيح).

قال الله تعالى: ﴿ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾[٥٧].

واتە/ یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکەکاری وخواپەرستی.

وقال ﷺ: ( والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه)[٥٨].

واتە/ خوای گەورە یارمەتی دەری بەندەی خۆیەتی هەتا بەندە یارمەتی دەری براکەی خۆی بێت.

س٤/ هل يجوز النذر لغير الله؟

ئایا دروستە نەزرکردن بۆ جگە لەخوای گەورە؟

ج٤/ لا يجوز النذر الا لله، لقول الله تعالى:

نەزرکردن دروست نىیە تەنها بۆ خودا نەبێت، خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾[٥٩].

واتە/ پەروەردگارم من نەزرم کردووە بۆ تۆ ئەوەی کە لە سکمدایە بۆ بەندایەتی کردنی تۆ وخزمەت کردنی( بيت المقدس).

وقوله ﷺ: ( من نذر أن يطيع الله فليطعه ومن نذر أن يعصيه فلا يعصيه)[٦٠].

واتە/ هەر کەسێك نەزری کرد وگوێ ڕایەڵی خوای تێدا بوو با گوێ ڕایەڵی بکات، وە هەر کەسێك نەزری کردو سەرپێچی خوای تێدا بوو با سەرپێچی نەکات.

س٥/ هل يجوز الذبح لغير الله؟

ئایا دروستە سەربڕین بۆ جگە لە خوا؟

ج٥/ لا يجوز، والدليل قول الله تعالى:

دروست نىیە، بەڵگەیش خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[٦١]. ( نسكي: ذبحي للحيوانات).

واتە/ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی نوێژەکانم وسەربڕین وژیان ومردنم بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیانە. هیچ هاوبەشێکی نىیە وبەو شێوەیە فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمین موسڵمانم لەم ئومەتەدا.(نسکی: حەیوان سەربڕینم).

﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾[٦٢]. (انحر: اذبح لله فقط ولا تذبح لغيره).

واتە/ نوێژ بۆ پەروەردگارت بکە وسەربڕینیشت تەنها بۆ ئەو بێت.

( انحر: حەیوان سەربڕە بۆ خوا بەتەنها، بۆ جگە لەخوا سەری مەبڕە).

وقال ﷺ: ( لعن الله من ذبح لغير الله)[٦٣].

---

57 - (المائدة / ٢).

58 - (رواه مسلم).

59 - (آل عمران / ٣٥).

60 - (رواه البخاري).

61 - (الأنعام / ١٦٢-١٦٣).

62 - ( الكوثر / ٢).

واتە/ نەفرەت لەو کەسەی حەیوان سەردەبڕێت بۆ جگە لەخوا.(لعن: دووری لە ڕەحم و بەزەیی خودا).

س٦/ هل يجوز الطواف حول غير الكعبة؟

ئایا دروستە سوڕانەوە بە دەوری جگە لە کەعبە؟

ج٦/ لا يجوز الطواف الا بالكعبة،

دروست نی‌یە سوڕانەوە تەنها بەدەوری کەعبەدا نەبێت،

قال الله تعالى: ﴿ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾[٦٤].

واتە/ با تەواف و سوڕانەوەیان بە دەوری ماڵە کۆنەکەدابێت،یاخود ماڵە ئازادکراوەکە(کەعبە).

وقال ﷺ: ( من طاف بالبيت سبعا وصلى ركعتين، كان كعتق رقبة)[٦٥].

واتە/ هەرکەسێك حەوت جار بەدەوری کەعبەدا بسوڕێتەوە، پاشان دوو رکات نوێژی سوننەت بکات، وەکو ئەوە وایە کە بەندەیەکی ئازاد کردبێت.

س٧/ ما حكم السحر؟

حوکمی جادوو کردن چی‌یە؟

ج٧/ السحر من الكفر،

جادوو کردن بێباوەڕی‌یە، قال الله تعالى: ﴿ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ ﴾[٦٦].

واتە/ بەڕاستی شەیتانەکان( لە جنۆکەو مرۆڤ) بێباوەڕبوون، بەهۆی ئەوەی خەڵکیان فێری جادوو دەکرد.

قال ﷺ: ( اجتنبوا السبع الموبقات: الشرك بالله، والسحر.....)[٦٧]. (الموبقات: المهلكات).

واتە/ دورکەونەوە و خۆتان بپارێزن لە حەوت لەناو بەرەکە: هاوبەش بڕیار دان بۆ خوای گەورە، جادوو کردن...

(الموبقات: لەناو بەرەکان).

س٨/ هل نصدق العراف والكاهن في علم الغيب؟

ئایا بڕوا بەجوکی وفاڵ گرەوەکان بکەین لە زانیاری غەیبدا؟

ج٨/ لا نصدقهما،

نەخێر بڕوایان پێ ناکەین، لقول الله تعالى:

﴿ قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ﴾[٦٨].

واتە/ ئەی محمد بەو خەڵکە ڕابگەیەنە کە هیچ کەسێك نەلە ئاسمانەکان ونەلە زەوی دا غەیب نازانێت تەنها خوا نەبێت.

وقال ﷺ: ( من أتى عرافا، أو كاهنا، فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد)[٦٩].

---

63 - (رواه مسلم).

64 - ( الحج / ٢٩).

65 - (صحيح رواه ابن ماجة).

66 - ( البقرة / ١٠٢).

67 - (رواه مسلم).

68 - ( النمل / ٦٥).

69 - ( صحيح رواه أحمد).

واتە/ هەر کەسێك بچێت بۆ لای جوکیەك، یاخود فاڵچیەك، وقسەکانی بەڕاست بزانێت، ئەوا کافر دەبێت بەو قورئانەی دابەزیوە بۆ سەر محمدﷺ.

س٩/ هل يعلم الغيب أحد؟

ئایا هیچ کەسێك غەیب دەزانێت؟

ج٩/ لا يعلم الغيب أحد الا الله،

هیچ کەسێك غەیب نازانێت جگە لە خوای گەورە، قال الله تعالى:

﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ﴾[٧٠].

واتە/ خەزێنەکانی غەیب لای خوای گەورەیە، هیچ کەسێك نایزانێت تەنها خۆی نەبێت.

وقالﷺ: ( لا يعلم الغيب الا الله)[٧١].

واتە/ هیچ کەسێك غەیب نازانێت جگە لە خوای گەورە .

س١٠/ ما حكم العمل بالقوانين المخالفة للاسلام؟

حوکمی کردەوە کردن چیە بەو دەستورانەی کە پێچەوانەی ئایینی ئیسلامن؟

ج١٠/ العمل بالقوانين المخالفة للاسلام كفر اذا أجازها، أو اعتقد صلاحيتها.

کردەوە کردن بەو دەستورانەی پێچەوانەی ئیسلامە کوفرە ئەگەر بە دروستی بزانێت، یاخود باوەڕی بە گونجاوی وچاکی ئەو دەستورە هەبێت.

قال الله تعالى: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[٧٢].

واتە/ هەر کەسێك حوکم نەکات بەو قورئانەی کە خوای گورە دایبەزاندووە وبڵێت ئەم حوکمە لە قورئان باشترە، یاخود وەکو قورئان وایە وجیاوازی نیە، یاخود قورئان باشترە بەڵام ئیش کردن بەم یاسایەیش دروستە ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە بەرامبەر بە قورئان .

وقالﷺ: ( وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله، ويتخيروا مما أنزل الله، الا جعل بأسهم بينهم)[٧٣].

واتە/ ئەگەر هەر کۆمەڵێك پێشەواکەیان حوکم نەکات بە قورئان، وە ویست وخواستی خۆیان بەجێ بهێنن بەرامبەر قورئان، ئەوا خوای گەورە ناکۆکی دەخاتە نێوانیانەوە.

س١١/ من خلق الله؟

کێ خوای گەورەی دروست کردووە؟

ج١١/ اذا وسوس الشيطان لأحدكم هذا السؤال فليستعذ بالله.

ئەگەر شەیتان دڵەڕاوکێی بۆدروست کردن بەم پرسیارە ئەوا پەنا بگرن بە خوایگەورە،

قال الله تعالى: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾[٧٤].

70 - ( الأنعام / ٥٩).
71 - ( حسن رواه الطبراني).
72 - ( المائدة / ٤٤).
73 - ( حسن رواه ابن ماجة وغيره).
74 - ( فصلت / ٣٦).

واتە/ ئەگەر شەیتان وەسوەسەو دڵەڕاوکێی بۆ دروست کردن ئەوا پەنا بگرن بەخوای گەورە لێی چونکە بەڕاستی خوای گەورە بیسەرو زانایە.

وعلمنا الرسول ﷺ أن نرد كيد الشيطان ونقول: ( آمنت بالله ورسوله، الله أحد، الله الصمد، لم يلد، ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد ثم لينفل عن يساره ثلاثاً، وليستعذ من الشيطان، ولينته، فانّ ذلك يذهب عنه )[٧٥].

پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین کە چۆن فێڵەکانی شەیتان ڕەد بکەینەوە، وە بڵێین: باوەڕم هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، خوای گەورە تاك وتەنهایە، خوای گەورە بێ پێویستە لە دروست کراوەکانی، کەسی لێ نەبووە، وە لە کەسیش نەبووە، وەهیچ کەسێکیش هاوشێوەی خوای گەورە نییە.

پاشان سێ جار تف بکات بەلای چەپیدا، وپەنا بگرێت بە خوای گەورە لە شەیتان، وە واز بێنێت لەو وەسوەسەیە، ئەم شتانە دەبنە هۆی لاچونی ئەو وەسوەسەیە.

يجب القول: بأن الله خالق وليس بمخلوق، ولتقريب ذلك من الأذهان نقول مثلاً: ان العدد اثنان قبله واحد، والواحد لاشيء قبله، فالله واحد لاشيء قبله،

پێویستە بوترێت: خوای گەورە دروست کەرەو دروست کراو نییە، بۆ زیاتر نزیك بوونەوەی ئەم شتە لەبیرو هۆشماندا دەڵێین: ژمارە دوو ژمارە یەك لەپێشیەتی، وە ژمارە یەك هیچ شتێك لەپێشەوەی نییە، خوای گەورە تاك وتەنهایە وهیچ شتێك لەپێشەوەی نەبووە،

قال ﷺ: ( اللهم أنت الأول فلا شيء قبلك )[٧٦]

واتە/ خوایە تۆ لەسەرەتاوە هەر بویتەو هیچ شتێك لە پێش تۆوە نەبووە.

س١٢/ ماهي عقيدة المشركين قبل الاسلام؟

بیروباوەڕی هاوبەش بڕیاردەرەکان چی بووە پێش هاتنی ئیسلام؟

ج١٢/ كانوا يدعون الأولياء للتقرب وطلب الشفاعة.

هاواریان دەکردو دەپاڕانەوە لە ئەولیاو پیاو چاکان بۆ خۆ نزیك کردنەوەو داوای شەفاعەت کردن لێیان.

١- قال الله تعالى: ﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾[٧٧].

واتە/ ئەوانەی کەوا جگە لەخوای گەورە کەسانێکی تریان دەکرد بە دۆستی خۆیان، وەدەیان ووت: ئێمە ئەمانە ناپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەلە خوامان نزیك بکەنەوە.

٢- قال الله تعالى: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾[٧٨].

واتە/ هاوبەش پەیدا کەرەکان جگە لە خوای گەورە شتانێکی تریان دەپەرست زیانیان نەبوو بۆیان ئەگەر نەیان پەرستایە، وسودیشیان نەبوو بۆیان کە دەیان پەرستن، دەیان ووت ئەمانە تکامان بۆ دەکەن لەلای خوای گەورە.

وبعض المسلمين يفعلون ذلك متشبهين بالمشركين.

هەندێك لە موسڵمانان ئەم کارە ئەنجام دەدەن وەك خۆ شوبهاندنێك بە هاوبەش پەیدا کەرەکان.

---

75 - ( هذه خلاصة الأحاديث الصحيح الواردة في البخاري ومسلم أحمد وأبي داود.).

76 - (رواه مسلم).

77 - ( الزمر / ٣).

78 - ( يونس / ١٨).

س١٣/ كيف تنفي الشرك بالله؟

چۆن نكۆڵی هاوبەش بڕیاردان بكەین بۆ خوا؟

ج١٣/ لا يتم نفي الشرك الا بنفي ما يلي:

تەواوێتی نكۆڵی كردنی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا دروست نابێت بە نكۆڵی كردنی ئەمانەی خوارەوە نەبێت:

١- الشرك في أفعال الرب، كالاعتقاد بأن هناك أقطاباً يدبرون الكون، مع أن الله يسأل المشركين:

﴿ومن يُدبِّرُ الأَمرَ فَسيقُولُونَ اللّهُ﴾[79].

هاوبەش بڕیاردان لە كردەوەكانی خوادا، وەك بڕوا بوون بەوەی چەند قوتبێك هەیە ئەم بوونەوەرە دەبەنە ڕێوە، لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە پرسیار لە هاوبەش پەیداكەرەكان دەكات:

كێ كاروباری ئەم بوونەوەرە دەباتە ڕێوە؟ ئەوانیش دەیان ووت: خوا دەیباتە ڕێوە.

٢- الشرك في العبادة: كدعاء الأنبياء والأولياء: لقول الله تعالى: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا﴾[80].

هاوبەش بڕیاردان لە پەرستندا: وەك پاڕانەوە لە پێغەمبەران وپیاوچاكان: خوای گەورە فەرمان دەكات بە پێغەمبەرەكەیﷺ بەو خەڵكە ڕابگەیەنە: بڵێ من تەنها هاوار لە پەروەردگارم دەكەم، وهیچ كەسێك ناكەم بە هاوبەشی.

وقول الرسولﷺ: (الدعاء هو العبادة)[81].

واتە/ پاڕانەوە خۆی بۆ خۆی پەرستنە.

٣- الشرك في صفات الله: كالاعتقاد بأن الرسل والأولياء يعلمون الغيب: قال الله تعالى: ﴿قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾[82].

هاوبەش بڕیاردان لەسیفەتەكانی خوای گەورەدا: وەك بڕوا بوون بەوەی كە پێغەمبەران وپیاو چاكان زانیاری غەیب دەزانن: خوای گەورە دەفەرمێت: ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ هیچ كەسێك لە ئاسمانەكان وزەویدا غەیب نازانێت جگە لە خوای گەورە.

١- الشرك في التشبيه: كأن يقول: لابد لي من واسطة بشر حين أدعو الله، كالأمير الذي لا أستطيع الدخول عليه الا بواسطة، فهذا شبه الخالق بالمخلوق، وهو من الشرك لقوله تعالى: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[83].

وينطبق عليه قول الله تعالى: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[84].

واذا تاب ونفى هذه الأنواع من الشرك فيكون موحداً.

اللهم اجعلنا من الموحدين، ولا تجعلنا من المشركين.

هاوبەش بڕیاردان لەلێكچواندنی خوای گەورە بە دروست كراوەكانی: وەك ئەوەی بڵێت: پێویستە من واسیتەیەكم هەبێت لە مرۆڤ كاتێك كە لە خوا دەپاڕێمەوە، وەك ئەو كاربەدەستەی كە ناتوانم بچم بۆلای مەگەر بەواسیتە

79 - (يونس / ٣١).

80 - (الجن / ٢٠).

81 - (رواه الترمذي وقال حسن).

82 - (النمل / ٦٥).

83 - (الشورى / ١١).

84 - (الزمر / ٦٥).

نەبێت، ئەمە خوا شوبهاندنە کەدروست کەرە بە دروست کراوەکانی، ئەمەیش بریتییە لە هاوبەش بڕیاردان، چونکە خوای گەورە دەفەرمێت: هیچ شتێك لەخوای گەورە ناچێت.

هەروەها ئەم ئایەتەی تریی بەسەردا جێبەجێ دەبێت کەخوای گەورە دەفەرمێت: ئەگەر هاوبەش بڕیار بدەیت بۆ خوای گەورە ئەوا هەموو کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، وە دەبیت لەو کەسانەی کە زەرەر مەندن.

بەڵام ئەگەر مرۆڤ تۆبە بکات وبگەڕێتەوە، نکوڵی بکات لەم جۆرانەی هاوبەش بڕیار دان ئەوا دەبێت بە مرۆڤێکی یەکخواپەرست، خوایە بمانگێڕیت لە یەکخواپەرستان، وەنەمان گێڕیت لە هاوبەش بڕیاردەران.

س١٤/ ماهو ضرر الشرك الاكبر؟

زیانی هاوبەش بڕیاردانی گەورە چییە؟

ج١٤/ الشرك الأكبر يسبب الخلود في النار.

زیانی هاوبەش بڕیاردانی گەورە دەبێتە هۆی مانەوەی هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا.

قال الله تعالى: ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾[85].

واتە/ بەڕاستی هەر کەسێك هاوبەش بڕیار بدات بۆ خوای گەورە ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات، وجێگایشی ئاگری دۆزەخ دەبێت، وەستەمکاران هیچ سەرخەرێکیان نییە کەڕزگاریان بکات.

وقالﷺ (ومن لقي الله يشرك به شيئاً دخل النار)[86].

واتە/ هەرکەسێك بگات بەخوای گەورە لە ڕۆژی دوایی دا هاوبەشێکی بۆ خوا دانابێت ئەوا دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

س١٥/ هل ينفع العمل مع الشرك؟

ئایا کردەوەی چاك هیچ سودی هەیە لەگەڵ هاوبەش بڕیارداندا؟

ج١٥/ لا ينفع العمل مع الشرك:

کردەوەی چاك سودی نییە لەگەڵ هاوبەش بڕیارداندا:

لقول الله تعالى: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[87].

واتە/ ئەگەر پێغەمبەران هاوبەشیان بڕیار بدایا بۆ خوا ئەوا هەموو کردەوەکانیان هەڵدەوەشایەوە.

وقالﷺ ﴿ قال الله تعالى: أنا اغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عملاً أشرك معي فيه غيري تركته وشركه﴾[88]

واتە/ من لە هەموو شەریکەکان( کاتێك کە پێویستیان بە شەریکی تر نییە) بێ پێویست ترم، جا هەر کەسێك کردەوەیەك بکات ویەکێکی تر بکات بە هاوبەشم لەو کردەوەیەدا، ئەوا من واز لەخۆیشی وکردەوەکەیشی دێنم (واتە: پاداشتی نادەمەوە).

85 - ( المائدة / ٧٢).

86 - (رواه مسلم).

87 - ( الأنعام / ٨٨).

88 - ( حديث قدسي رواه مسلم).

# الشرك الأصغر وأنواعه

## هاوبەش بڕیاردانی بچوك و جۆرەكانی

س١/ ما هو الشرك الأصغر؟

هاوبەش بڕیاردانی بچوك چی‌یە؟

ج١/ الشرك الأصغر هو الرياء،

هاوبەش بڕیاردانی بچوك بریتی‌یە لە ڕیابازی (بەرچاوی كردن)،

قال الله تعالى:﴿ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾[89].

واتە/ هەر كەسێك بەهیوای ئەوەیە بگات بە خوای گەورە با كردەوەی چاك ئەنجام بدات( لەسەر سوننەت)، وهیچ كەسێك نەكات بە هاوبەشی خوا لەپەرستنی دا( نیەتی پاك بێت وبەدڵسۆزی تەنها بۆ خوای ئەنجام بدات).

وقال ﷺ: ( ان أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر: الرياء)[90].

واتە/ بەڕاستی ترسناك ترین شت كە من لێتان بترسم توشی ببن هاوبەش بڕیاردانی بچوكە: كە بریتی‌یە لە ڕیاكردن.

ومن الشرك الأصغر قول الرجل: لولا الله وفلان، ما شاء الله وشئت.

وە لە هاوبەش بڕیاردانی بچوك: ووتەی كەسێك كە بڵێت: ئەگەر خواو فلانە كەس نەبوایە، ئەگەر خواو تۆ ویستت لێ بێت.

وقال ﷺ: ( لا تقولو ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا: ماشاء الله ثم شاء فلان )[91].

واتە/ مەڵێن ئەگەر خواو فلانە كەس ویستی لێ بێت، بەڵكو بڵێن: خوا ویستی لێ بێت پاشان فلان كەس.

س٢/ هل يجوز الحلف بغير الله؟

ئایا دروستە سوێند خواردن بە غەیری خوا؟

ج٢/ لا يجوزالحلف بغير الله، قال الله تعالى:﴿ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ﴾[92].

نەخێر سوێند خواردن بە غەیری خوا دروست نی‌یە، خوای گەورە دەفەرمێت: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بەجەخت لەسەر كراوی‌یەوە زیندوو دەكرێنەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد بەپەروەردگار ئەگەر دروست بوایە بەغەیری خوا سوێندی دەخوارد.

وقال ﷺ: (من حلف بغير الله فقد أشرك )[93].

واتە/ هەر كەسێك سوێند بخوات بە غەیری خوا ئەوا بەڕاستی هاوبەشی بۆ خوا داناوە.

وقال ﷺ: (من كان حالفاً فيحلف بالله أو ليصمت )[94].

---

89 - ( الكهف / ١١٠).

90 - ( صحيح رواه أحمد).

91 - ( صحيح رواه أحمد).

92 - ( التغابن / ٧).

93 - ( صحيح رواه أحمد).

94 - ( متفق عليه).

واتە/ هەر کەسێك دەیەوێت سوێند بخوات، با سوێند بخوات بە خوای گەورە یاخود بێ دەنگ بێت.

وقد يكون الحلف بالأنبياء أو الأولياء من الشرك الأكبر، وذلك اذا اعتقد الحالف أن للولي تصرفاً يضره، ولذلك يخاف من الحلف به كاذباً علماً بأن الشرك الأصغر من كبائر الذنوب ولا يخلد صاحبه في النار.

هەندێ جار سوێند خواردن بە پێغەمبەران وپیاو چاکان دەبێتە هاوبەش دانانی گەورە، ئەویش بەوە دەبێت کە سوێند خۆرەکە باوەڕی وابێت کە ئەو پیاوچاکە شتی بەدەستە وزیانی پێ دەگەیەنێت، بۆیە دەترسێت لەوەی کە سوێندی بە درۆ پێ بخوات، زانراویشە کە هاوبەش دانانی بچوك لە تاوانە گەورەکانە وخاوەنەکەی بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە.

س٣/ هل نلبس الخيط والحلقة للشفاء؟

ئایا دەزوو ئەڵقە هەڵواسین بەخۆماندا بۆ شیفا؟

ج٣/ لا نلبسهما، لقول الله تعالى: ١- ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ﴾[95].

هەڵیان ناواسین بە خۆماندا بۆ شیفا، چونکە خوای گەورە دەفەرمێت: ئەگەر خوای گەورە توشی زیانێکت بکات ئەوا کەس ناتوانێت لای بەرێت لەسەرت تەنهاخوای گەورە خۆی نەبێت .

٢-عن حذيفة أنه رأى رجلاً في يده خيط من الحمى فقطعه، وتلا قول الله تعالى: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾[96].

واتە/ حوزەیفە پیاوێکی بینی دەزوویەك لەدەستی دا بوو بۆلەرزوتا، ئەمیش بچڕاندی وئەم ئایەتەی خوێندەوە:

واتە/ زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن الا لەگەڵ باوەڕەکەیاندا هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن[97].

س٤/ هل نعلق الخرزة والودعة ونحوهما من العين؟

ئایا مورو هێلکە شەیتانۆکە هەڵواسین بۆ چاوەزار؟

ج٤/ لا نعلقهما من العين،

هەڵیان ناواسین بۆ چاوەزار، لقول الله تعالى: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ﴾[98].

واتە/ ئەگەر خوای گەورە تووشی زیانت بکات ئەوا کەس ناتوانێت لەسەرت لای بەرێت تەنها خۆی نەبێت.

وقولهﷺ: (من علق تميمة فقد أشرك)[99].

(التميمة: الخرزة أو الودعة تعلق من العين).

واتە/ هەرکەسێك مروویەك یان هێلکە شەیتانۆکەیەك هەڵبواسێت ئەوا بەڕاستی هاوبەشی بۆ خوای گەورە داناوە.

( التميمة: مروو یان هێلکە شەیتانۆکە هەڵواسرێت بۆ چاوەزار).

95 - ( الأنعام / ١٧).
96 - ( يوسف / ١٠٦).
97 - ( صحيح رواه ابن أبي حاتم).
98 - ( الأنعام / ١٧).
99 - ( صحيح رواه أحمد).

# التوسل وطلب الشفاعة

## هۆکار بۆ نزیك بوونەوە لەخوا وداواکردنی شەفاعەت

س١/ بماذا نتوسل الى الله؟

بەچی هۆکارێك خۆمان نزیك بکەینەوە لە خوا؟

ج١/ التوسل منه جائز ومنه ممنوع:

هۆکاری خۆنزیك کردنەوە لە خوا هەیە دروستە وە هەیە دروست نیە:

١- التوسل الجائز والمطلوب هو التوسل بأسماء الله وصفاته والعمل الصالح، وطلب الدعاء من الاحياء الصالحين،

هۆکاری دروست وداواکراو بۆخۆنزیك کردنەوە لە خوا بریتیە لە خۆنزیك کردنەوە لە خوا بەهۆی ناووسیفاتەکانی خوای گەورە و،کردەوەی چاك، وداواکردنی پاڕانەوە لەپاوچاکە زیندووەکان ( واتە: داوایان لێ بکەیت بۆت بپاڕێنەوە لە خوا).

قال الله تعالى: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾[100].

واتە/ خوای گەورە چەندەها ناوی بەرزو جوانی هەیە جا ئێوە بەو ناوانەوە لە خوا بپاڕێنەوە.

وقال الله تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ﴾[101].

( أي تقربوا اليه بطاعته، والعمل بما يرضيه)[102].

واتە/ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن و خۆتان نزیك بکەنەوە لە خوا بەهۆکاری شەرعی.

( واتە / خۆتان نزیك بکەنەوە لە خوا بە گوێڕایەڵی کردنی، وەبەو کردەوانەی کە لێی ڕازیە).

وقال الرسولﷺ: (أسألك بكل اسم هو لك سميت به نفسك)[103].

واتە/ خوایە من داوات لێ دەکەم بەهەموو ناوێك کە هی تۆیە وناوی خۆتت پێناوە.

وقوله ﷺ للصحابي الذي سأله مرافقته في الجنة: ( أعني على نفسك بكثرة السجود)[104].

( أي الصلاة وهي من العمل الصالح).

واتە/ پێغەمبەری خواﷺ بەو هاوەڵەی فەرموو کە داوای کرد لە پێغەمبەرﷺ ببێ بەهاوەڵی لە بەهەشتدا: یارمەتیم بدە بۆ خۆت بەزۆر بردنی سوجدە.

( واتە/ نوێژ کردن کە ئەویش بریتیە لە کردەوەی چاك).

وكقصة أصحاب الغار الذين توسلوا بأعمالهم الصالحة ففرج الله عنهم.

---

100 - ( الأعراف / ١٨٠).

101 - ( المائدة / ٣٥).

102 - ( ذكره ابن كثير نقلا عن قتادة ).

103 - ( صحيح رواه أحمد).

104 - (رواه مسلم).

وە وەکو چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە ئەوانەی کە بە هۆی کردەوەکانی خۆیانەوە داوایان کرد لە خوای گەورە، خوای گەورەیش ڕزگاری کردن.

ويجوز التوسل بحب الله، وحبنا للرسولﷺ والأولياء لأن حبنا لهم من العمل الصالح.

وەدروستە خۆشەویستیت بۆ خوای گەورە و پێغەمبەرﷺ وپیاوچاکان بکەیت بەهۆکاری خۆ نزیك کردنەوە چونکە خۆشەویستیمان بۆ ئەوان لە کردەوەی چاکە.

٢- التوسل الممنوع هو التوسل بالأموات، وطلب الحاجات منهم، كما هو واقع اليوم، وهو شرك أكبر،

هۆکاری نادروست بۆ خۆ نزیك کردنەوە لە خوای گەورە، بریتییە لە خۆ نزیك کردنەوە لە خوای گەورە بە هۆی مردووەکانەوە، وە داوای پێویستییەکانت لەوان بکەیت، هەروەکو چۆن لەم ڕۆژگارەدا باوە، ئەوەیش بریتییە لە هاوبەش دانانی گەورە،

لقول الله تعالى: ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ﴾[105]. ( أي المشركين).

واتە/ مەپاڕێرەوە لە غەیری خوا کەنەسودت پێ دەگەیەنن ونەزیان، خۆ ئەگەر وات کرد ئەوا تۆ دەبیت لە ستەمکاران.( واتە/ هاوبەش بڕیاردەران).

٣- أما التوسل بجاه الرسولﷺ كقولك:( يارب بجاه محمد اشفني) لادليل عليه، لأن الصحابة لم يفعلوه، ولأن عمر توسل بالعباس حيا بدعائه، و لم يتوسل بالرسولﷺ بعد موته، وهذا التوسل قد يؤدي الى الشرك، وذلك اذا اعتقد أن الله محتاج لواسطة بشر كالأمير والحاكم، لأنه شبه الخالق بالمخلوق.

بەڵام بەهۆکار دانانی خاتری پێغەمبەرﷺ بۆ نزیك بوونەوە لە خوا وەك ئەوەی بڵێی: ( خوایە بۆ خاتری پێغەمبەرﷺ شیفام بدەیت) هیچ بەڵگەی لەسەر نییە، چونکە هاوەڵان نەیان کردووە، وەلەبەر ئەوەی ئیمامیعومەر (خوای لێ ڕازی بێت)پاڕانەوەکەی ئیمامی عەباسی( خوای لێ ڕازی بێت) کردە هۆکار بۆباران بارین چونکە زیندوو بوو، پێغەمبەریﷺ نەکرد بە هۆکار لە پاش مردنی، بەکارهێنانی ئەم هۆکارەیش هەندێ جار سەر دەکێشێت بۆ هاوبەش دانان، ئەویش کاتێك دەبێت کە باوەڕی وابێت خوای گەورە پێویستی بە واسیتەی مرۆڤە وەکو دەسەڵات دارو حاکمەکان، لەبەر ئەوەی ئەو کەسە لەوکاتەدا خوای گەورەی شوبهاندووە بە دروست کراوەکانی.

وقال أبو حنيفة: ( أكره أن أسأل الله بغير الله)[106].

واتە/ من زۆرم پێ ناخۆشە داوا بکەم لە خوا بەواسیتەی غەیری خواوە.

س٢/ هل يحتاج الدعاء لواسطة مخلوق؟

ئایا پاڕانەوە پێویستی بە واسیتەی دروست کراوەکان هەیە؟

ج٢/ لا يحتاج الدعاء لواسطة مخلوق لقول الله تعالى:

پاڕانەوە پێویستی بەواسیتەی دروست کراوەکان نییە لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾[107].

---

[105] - ( يونس / ١٠٦).

[106] - ( ذكره صاحب الدر المختارة ).

[107] - ( البقرة / ١٨٦).

واتە/ هەرکاتێك بەندەکانم پرسیاری منیان لێت کرد ئەی محمدﷺ ئەوا من لەوانەوە نزیکم و داوای هەر شتێك بکەن وەڵامیان دەدەمەوە.

وقولهﷺ: ﴿ انكم تدعون سميعاً قريباً وهو معكم﴾[108]. ( بعلمه يسمعكم ويراكم).

واتە/ ئێوە داوا لەخوایەك دەکەن کە بیسەر و نزیکە لێتانەوە و لەگەڵتاندایە.( بەزانیاری خۆی وووتەکانتان دەبیستێت ودەتان بینێت ).

س٣/ هل يجوز طلب الدعاء من الأحياء؟

ئایا دروستە داوا لەزیندووەکان بکەیت بۆت بپاڕێنەوە؟

ج٣/ نعم يجوز طلب الدعاء من الأحياء لا الأموات.

بەڵێ دروستە داوا بکەیت لە زیندووەکان بۆت بپاڕێنەوە نەك لە مردووەکان.

قال الله تعالى يخاطب الرسولﷺ حياً: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾[109].

واتە/ داوای لێخۆش بوون بکە لە خودا بۆ تاوانەکانی خۆت وبڕواداران لە پیاوان ولە ژنان.

وفي الحديث الصحيح الذي رواه الترمذي: ﴿ أن رجلاً ضرير البصر أتى النبيﷺ فقال: ادع الله أن يعافيني....﴾.

واتە/ پیاوێکی چاو کوێر هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ وپێی فەرموو: داوام بۆ بکە لە خوا چاکم بکاتەوە....

س٤/ ماهي واسطة الرسولﷺ؟

واسیتەی پێغەمبەرﷺ چیيە لە نێوان ئێمە وخوادا؟

ج٤/ واسطة الرسولﷺ هي التبليغ،

واسیتەی پێغەمبەرﷺ بریتیيە لەگەیاندنی دینەکەی خوا، قال الله تعالى:

﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾[110].

واتە/ ئەی پێغەمبەرﷺ ئەوەی لە لایەن خواوە بۆت هاتووە ڕای بگەیەنە بەو خەڵکە.

وقالﷺ: (اللهم أشهد) جواباً لقول الصحابة: ( نشهد أنك قد بلغت)[111].

واتە/ خوایە تۆ بەشاهید بە. ئەمە وەڵام بوو بۆ هاوەڵان کە فەرموویان: شایەتی دەدەین کەتۆ دینەکەت ڕاگەیاند.

س٥/ ممن نطلب شفاعة الرسولﷺ؟

داوای شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ لەکێ بکەین؟

ج٥/ نطلب شفاعة الرسولﷺ من الله،

داوای شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ لەخوا دەکەین، قال الله تعالى:

﴿ قُلْ لِلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا ﴾[112].

واتە/ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ شەفاعەت هەمووی بۆ خوایە وبەدەستی ئەوە.

108 - (رواه مسلم).

109 - ( محمد / ١٩).

110 - ( المائدة / ٦٧).

111 - (رواه مسلم).

112 - ( الزمر / ٤٤ ).

علمﷺ الصحابي أن يقول: ( اللهم شفعه في)[113]. ( أي شفع الرسولﷺ في).

واتە/ پێغەمبەرﷺ هاوەڵەکەی فێر کرد بڵێت: خوایە پێغەمبەرﷺ بکە بە شەفاعەت کارم.( واتە/ پێغەمبەرﷺ بکە بە تکاکارم).

وقال ﷺ: ( اني خبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة، فهي نائلة ان شاء الله، من مات من أمتي لا يشرك بالله شيئاً)[114].

واتە/ من دوعا وپاڕانەوەکەی خۆمم هەڵگرتووە تاکو ببێ بە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی دواییدا، جا شەفاعەتەکەی من وەردەگرێ بە ویستی خوا هەر کەسێك مردبێت لە ئوممەتەکەم و هیچ هاوبەشێکی بۆ خوا دانەنابێت.

س٦/ هل نطلب الشفاعة من الأحياء؟

ئای داوای شەفاعەت بکەین لەزیندووەکان؟

ج٦/ نطلب الشفاعة من الأحياء في أمور الدنيا:

داوای شەفاعەت دەکەین لە زیندووەکان لە کاروباری دونیادا: قال الله تعالى: ﴿ مَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُنْ لَهُ نَصِيبٌ مِنْهَا وَمَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُنْ لَهُ كِفْلٌ مِنْهَا﴾[115].

( أي نصيب من وزرها).

واتە/ هەر کەسێك شەفاعەت وتکای باش بکات بۆ خەڵکی ئەوا خۆیشی بەشدارە لەو چاکەیەدا، وە هەر کەسێك شەفاعەت وتکای خراپ بکات بۆ خەڵکی ئەوا ئەو کەسە خۆیشی بەشدارە لەو خراپەیەدا. ( واتە/ بەشدارە لە تاوانەکەی ).

وقال ﷺ: ( اشفعوا تؤجروا)[116].

واتە/ شەفاعەت بکەن بۆ یەکتری پاداشت وەردەگرن.

س٧/ هل نبالغ ونزيد في مدح الرسولﷺ؟

ئایا زیادڕەوی بکەین لە پیاداهەڵدان بەسەر پێغەمبەرﷺ؟

ج٧/ لا نبالغ ولا نزيد في مدحه،

نەخێر زیادڕەوی ناکەین لەپیاداهەڵدان بەسەریدا،

قال الله تعالى: ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾[117].

واتە/ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ من تەنها مرۆڤێکم وەکو ئێوە، بەڵام من ئەوەم لەئێوە جیاوازە کە سروشم بۆ دێت لەلایەن خواوە، کەپەرستراوی ئێوە تەنها یەك پەرستراوە ئەویش خوای گەورەیە.

وقالﷺ: ( لا تطروني كما أطرت النصارى عيسى ابن مريم، فانما أنا عبد، فقولوا عبد الله ورسوله)[118].( الاطراء: هو المبالغة والزيادة في المدح).

---

113 - (رواه الترمذي وقال حسن صحيح).

114 - (رواه مسلم).

115 - ( النساء / ٨٥).

116 - (صحيح رواه أبو داود).

117 - ( الكهف / ١١٠).

118 - (رواه البخاري).

واتە/ زیادڕەوی مەکەن لە پیاهەڵدان بەسەرمدا هەروەکە چۆن گاورەکان زیادەڕەوییان کرد لە پیاهەڵدان بەسەر عیسای کوڕی مەریەمدا، من تەنها بەندەیەکم، جا ئێوەیش پێم بڵێن بەندەی خواو نێردراوی خوا.

( الاطراء: بریتییە لە زیادەڕەوی کردن لە پیاهەڵداندا).

س٨/ من هو أول المخلوقات؟

کێ یەکەم دروستکراوە لە دروست کراوەکانی خوا؟

ج٨/ أول المخلوقات من البشر آدم، ومن الأشياء القلم،

یەکەم دروست کراو لە دروست کراوەکانی خوا لە مرۆڤدا بریتی بوو لە ئادەم، وەلە شتەکاندا (شتی بێ گیان) بریتی بوو لە پێنوس،

قال الله تعالى: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ﴾[119].

واتە/ ئەی محمد ﷺ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە کاتێك خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو: من دەمەوێت مرۆڤێك دروست بکەم لە قوڕ.

وقوله ﷺ: ( كلكم بنو آدم، وآدم خلق من تراب)[120].

واتە/ ئێوە هەمووتان نەوەی ئادەمن، وەئادەم دروست کراوە لە خۆڵ.

وقوله ﷺ: ( ان أول ما خلق الله القلم)[121]. (أي بعد الماء والعرش).

واتە/ یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد بریتی بوو لە پێنووس.(واتە/ دوای ئاوو عەرش).

وأما حديث: ( أول ما خلق الله نور نبيك يا جابر). فهو موضوع ومكذوب يخالف القرآن والسنة والعقل والنقل، فقال السيوطي: لا سند له، وقال الغماري: موضوع، وقال الألباني: باطل.

بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ: یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کردووە نور و ڕوناکی پێغەمبەرەکەتە ﷺ ئەی جابر.

ئەم فەرموودەیە درۆیە و هەڵبەستراوە و پێچەوانەی قورئان و سوننەت و عەقڵ وبەڵگەیە، سیوطی دەفەرمێت: هیچ سەنەدێکی نییە، وە غوماری دەفەرمێت: هەڵبەستراوە، وە ئەلبانی دەفەرمێت: بەتاڵە.

---

119 - ( ص / ٧١).

120 - (رواه البزار وصححه الألباني).

121 - (رواه أبو داود والترمذي وقال حسن صحيح).

# الجهاد والولاء والحكم

## تێکۆشان وخۆشەویستی وحوکم ویاسا

س١/ ما حكم الجهاد في سبيل الله؟

حوکمی تێکۆشان لەڕێگەی خودا چیە؟

ج١/ الجهاد واجب بالمال والنفس واللسان حسب الاستطاعة.

تێکۆشان لەڕێگەی خودا پێویستە بەماڵ وگیان و زوبان بەپێ ی توانا.

قال الله تعالى:

﴿ انْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾[١٢٢].

واتە/ دەرچن بۆ تێکۆشان لە ڕێگەی خوا لە کاتێکدا کە سوك وئاسانە لەسەرتان، وە لەکاتێکشدا کە قورس و گرانە لەسەرتان، وە تێکۆشن بە ماڵ و گیانتان لە ڕێگەی خوادا.

وقالﷺ: ( جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسنتكم)[١٢٣]. ( بقدر الاستطاعة).

واتە/ تێکۆشن بەرامبەر هاوبەش بڕیاردەرەکان بە ماڵ وگیان زمانتان. (بەپێی توانا).

س٢/ ما هو الولاء؟

خۆشەویستی چیە؟

ج٢/ الولاء هو الحب والنصرة للمؤمنين الموحدين.

خۆشەویستی بریتیە لە خۆشویستن وسەرخستنی باوەڕدارە یەکخواپەرستەکان.

قال الله تعالى: ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾[١٢٤].

واتە/ باوەڕداران لە پیاوان ولە ژنان هەندێکیان خۆشەویست وسەرخەری هەندێکی تریانن.

وقالﷺ: ( المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً)[١٢٥].

واتە/ باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەکو دیوارێك وایە کە هەندێکی هەندێکی تری پتەوە دەکات.

س٣/ هل تجوز موالاة الكفار ونصرهم؟

ئایا خۆشەویستن و سەرخستنی بێ باوەڕەکان دروستە؟

ج٣/ لا تجوز موالاة الكفار ونصرهم،

دروست نیە دۆستایەتی کردنی بێباوەڕەکان وسەرخستنیان،

قال الله تعالى: ﴿ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾[١٢٦].

واتە/ هەر کەسێك لەئێوە دۆستایەتی بێباوەڕەکان بکات ئەوا ئەویش لەوانە.

وقالﷺ: ( ان آل بني فلان ليسوا لي بأولياء)[١٢٧].

---

122 - ( التوبة / ٤١).

123 - (صحيح أبو داود ).

124 - ( التوبة / ٧١).

125 - (رواه مسلم).

126 - ( المائدة / ٥١).

127 - ( متفق عليه).

واتە/ وەچەو نەوەی فلان کەس دۆستی من نین.

س٤/ من هو الولي؟

کێ خۆشەویستی خوایە (الولي)ە؟

ج٤/ الولي هو المؤمن التقي،

خۆشەویستی خوا بریتییە لە باوەڕدارێکی لەخوا ترس، قال الله تعالى: ﴿ أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾[128].

واتە/ ئاگادار بن خۆشەویستانی خوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و غەمباریش نین.خۆشەویستانی خوایش ئەو کەسانەن کە باوەڕیان هێناوە ولەخوا دەترسن.

وقالﷺ: ( انما وليي الله، وصالح المؤمنين)[129].

واتە/ خۆشەویستی من تەنها خوای گەورەو بڕوادارە چاکەکانە.

س٥/ بماذا يجب أن يحكم المسلمون؟

پێویستە موسڵمانان حوکم بەچی بکەن؟

ج٥/ يجب أن يحكموا بالقرآن والحديث الصحيح.

پێویستە حوکم بکەن بە قورئان و فەرمودە ڕاستەکان.

قال الله تعالى: ﴿ وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾[130].

واتە/ ئەی محمدﷺ حوکم بکە لە نێوانیاندا بەو قورئانەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە.

وقالﷺ: ( أما بعد، ألا أيها الناس فانما أنا بشر يوشك أن يأتي رسول ربي فأجيب، وأنا تارك فيكم ثقلين: أولهما كتاب الله، فيه الهدى والنور، فخذوا كتاب الله واستمسكوا به)فحث على كتاب الله ورغب فيه، ثم قال: ( وأهل بيتي)[131].

واتە/ ئەی خەڵکینە ئاگادار بن من مرۆڤێکم وەکو ئێوە نزیکە نێردراوی خوا (ملك الموت) بێت بۆلام و منیش وەڵامی بدەمەوە، وە من دوو شتی قورس و گرانم لەناوتاندا جێ هێشتووە یەمەمیان ئەو قورئانەی خوایە، کەپڕە لە ڕێنمایی ورووناکی، جا قورئانەکەی خوا وەربگرن ودەستی پێوە بگرن. پێغەمبەرﷺ خەڵکی هاندا بۆ دەست گرتن بە قورئانەکەی خوا، پاشان فەرمووی: ( وە خزم وکەس وکار و بنەماڵەی من).

وقولهﷺ: ( تركت فيكم أمرين لن تضلوا ما ان تمسكتم بهما: كتاب الله، وسنة رسوله)[132]

واتە/ دوو شتم بەجێ هێشتووە لەناوتاندا گومڕانابن ئەوەندەی دەستیان پێوە بگرن: قورئانەکەی خوا، وسوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ.

---

128 - ( يونس / ٦٢-٦٣).

129 - ( متفق عليه).

130 - ( المائدة / ٤٩).

131 - (رواه مسلم).

132 - ( رواه مالك، وصححه الألباني ومحقق جامع الأصول لشواهده ).

# العمل بالقرآن والحديث

## ئیش کردن به قورئان و فەرموودە

س١/ لماذا أنزل الله القرآن؟

بۆچی خوای گەورە قورئانی دابەزاندووە؟

ج١/ أنزل الله القرآن للعمل به،

خوای گەورە قورئانی دابەزاندووە بۆ ئیش کردن پێی،

قال الله تعالى: ﴿ اتَّبِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾[133].

واتە/ شوێنی ئەو قورئانە بکەون کە بۆتان دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە.

وقالﷺ: ( اقرؤا القرآن واعملوا به ولاتأكلوا به...)[134].

واتە/ قورئان بخوێننەوە و کردەوەی پێ بکەن، وپارەی پێ پەیدا مەکەن....( واتە/ کەسابەتی پێوە مەکەن لە تەعزێ خانەکان وسەر گۆڕستانەکان و...

س٢/ ما حكم العمل بالحديث الصحيح؟

حوکمی کردەوە کردن چییە بە فەرموودەی ڕاست؟

ج٢/ العمل بالحديث الصحيح واجب:

کردەوە کردن بە فەرموودەی ڕاست پێویستە:

قال الله تعالى: ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾[135].

واتە/ ئەو شتەی پێغەمبەری خواﷺ بۆی هێناون و فەرمانی پێ کردوون وەری بگرن، وە ئەوەیشی قەدەغە کردووە وازی لێ بهێنن.

وقالﷺ: ( عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين، تمسكوا بها)[136].

واتە/ پێویستە لەسەرتان دەست بگرن بە سوننەتی من وسوننەتی جێنیشینە ڕێنمایی کارەکان، دەستی پێوە بگرن. ( واتە/ بەو سوننەتەوە).

س٣/ هل نستغني بالقرآن عن الحديث؟

ئایا بە قورئان بێ پێویست دەبین لە فەرموودە؟

ج٣/ لا نستغني بالقرآن عن الحديث.

تەنها بە قورئان بێ پێویست نابین لە فەرموودە.

قال الله تعالى:

﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[137].

---

133 - ( الأعراف / ٣).

134 - (صحيح رواه أحمد).

135 - ( الحشر / ٧).

136 - (صحيح رواه أحمد).

137 - ( النحل / ٤٤).

واتە/ ئەی محمد ﷺ سوننەتمان بۆت ناردووە تا قورئانی پێ ڕوون بکەیتەوە بۆ خەڵکی، بەڵکو ئەوانیش بیر بکەنەوە لەو قورئانە.

وقال ﷺ: ( ألا واني أوتيت القرآن ومثله معه)[138].

واتە/ ئاگادار بن من چەندێك قورئانم پێ بەخشراوە بەوێنەی ئەوەیش سوننەتم پێ بەخشراوە.

س٤/ هل نقدم قولاً على قول الله ورسوله؟

ئایا وتەی هیچ کەسێك پێش بخەین بەسەر وتەی خوا وپێغەمبەری خوا ﷺ؟

ج٤/ لا نقدم قولاً على قول الله ورسوله:

وتەی هیچ کەسێك پێش ناخەین بەسەر وتەی خواو پێغەمبەر ﷺ:

قال الله تعالى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾[139].

واتە/ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە دەست پێشخەری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ مەکەن لە هیچ شتێکدا.

وقوله ﷺ: ( لا طاعة لأحد في معصية الله انما الطاعة في المعروف)[140].

واتە/ گوێ ڕایەڵی کردنی هیچ کەسێك ناکرێت لەسەرپێچی کردنی خوادا، گوێ ڕایەڵی کردن تەنها لەچاکەدا دەبێت.

وقول ابن عباس: (أراهم سيهلكون، أقول: قال النبي ﷺ، ويقولون: قال أبو بكر وعمر)[141].

واتە/ من وا دەبینم ئەو کۆمەڵە لەناو دەچن، من پێیان دەڵێم: پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرمووە، کەچی ئەوان دەڵێن: ئەبو بەکر وعومەر وایان وتووە.

س٥/ ماذا نفعل اذا اختلفنا في أمور ديننا؟

چی بکەین ئەگەر جیاواز بووین لەکاروباری ئاینەکەماندا؟

ج٥/ نعود الى الكتاب والسنة الصحيحة.

دەگەڕێینەوە بۆ قورئان وسوننەتە ڕاستەکان.

قال الله تعالى: ﴿ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآَخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾[142].

واتە/ ئەگەر ناکۆك بوون لەهەر شتێکدا ئەوا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا (واتە/ قورئانەکەی) وپێغەمبەرەکەی( ئەگەر لەژیاندا بوو، لە دوای مردنیشی دەگەڕێینەوە بۆ لای سوننەتەکانی)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و ڕۆژی دوایی، ئەو گەڕانەوەتان بۆ لای قورئان وسوننەت چاکترە وباشترین گەڕانەوەیە.

وقال ﷺ: ( تركت فيكم أمرين لن تضلوا ما تمسكتم بهما: كتاب الله وسنة رسوله)[143].

واتە/ دوو شتم جێ هێشتووە لەناوتاندا گومڕا نابن ئەوەندەی دەستیان پێوە بگرن: ئەویش قورئانەکەی خوا و سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.

138 - ( صحيح رواه أبو داود وغيره)..
139 - (الحجرات / ١).
140 - ( متفق عليه).
141 - ( رواه أحمد وصححه أحمد شاكر).
142 - (النساء / ٥٩).
143 - (رواه مالك وصححه الألباني في الجامع).

س٦/ کیف نحب الله ورسوله؟

چۆن خواو پێغەمبەری خوامانﷺ خۆش بووێت؟

ج٦/ نحبهما بطاعتهما، واتباع أوامرهما:

خواو پێغەمبەری خوامانﷺ خۆش دەوێت بەگوێ ڕایەڵی کردنیان، وشوێن کەوتنی فەرمانەکانیان:

قال الله تعالى: ﴿ قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾[١٤٤].

واتە/ ئەی محمدﷺ بەو خەڵکە بڵێ ئەگەر ئێوە بە ڕاستی خواتان خۆش دەوێت ئەوا شوێن سوننەتەکانی من بکەون، خوای گەورەیش ئێوەی خۆش دەوێت و لەتاوانەکانتان دەبورێت، خوای گەورە زۆر لێبوردە وبەبەزەییە.

وقالﷺ ( لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده والناس أجمعين)[١٤٥].

واتە/ باوەڕی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نییە تاوەکو من خۆشەویست تر نەبم لەلای لەباوکی و منداڵەکانی ولە هەموو خەڵکی.

س٧/ هل نترك العمل ونتكل على القدر؟

ئایا واز لە کردەوە بهێنین وپاڵ بدەینەوە بەسەر قەزاو قەدەردا؟ (واتە/ کردەوە نەکەین و هەرچیمان توش بوو لە چاکە وخراپە بڵێین قەزاو قەدەرە).

ج٧/ لا نترك العمل،

واز لە دردەوە ناهێنین، لقول الله تعالى: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى ﴾[١٤٦].

واتە/ هەر کەسێك ببەخشێت لەڕێگای خوادا و لەخوا بترسێت، وە پاداشتی خوای گەورە بەڕاست بزانێت، ئەوا ئێمەیش کاری چاکی بۆ ئاسان دەکەین.

وقولهﷺ: ( اعملوا فكل ميسر لما خلق له)[١٤٧].

واتە/ کردەوە بکەن بەو شتانەی کەوا فەرمانتان پێ کراوە، هەر یەکێك لەئێوە ئامادە کراوە بۆ ئەو کردەوانەی کە بۆی دروست کراوە لە قەدەردا.

وقولهﷺ: ( المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف، وفي كل الخير، احرص على ما ينفعك واستعن بالله، ولا تعجز، فان أصابك شيء فلا تقل: لو أني فعلت كان كذا كذا، ولكن قل قدر الله وما شاء فعل، فـان لـو تفـتح عمـل الشيطان)[١٤٨].

واتە/ باوەڕداری بەهێز چاکتر وخۆشەویست ترە لای خوای گەورە لە باوەڕداری لاواز، وە هەردووکیان خێریان تێدایە، هەوڵ وکۆشش بدە بۆ ئەو شتانەی سودت پێ دەگەیەنێت، داوای یارمەتیش لە خوا بکە، وە بێ دەسەڵات مەبە، ئەگەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە ئاوا وئاوا دەبوو، بەڵام بڵێ بەڕاستی ووتنی ئەگەر کردەوەی شەیتان دەکاتەوە.

---

144 - ( آل عمران / ٣١).

145 - ( متفق عليه).

146 - ( الليل / ٥-٧).

147 - (رواه البخاري ومسلم).

148 - (رواه مسلم).

# يستفاد من الحديث

## ئەو سودانەی کە لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێت

ان المؤمن الذي يحبه الله هو المؤمن القوي الذي يعمل ويحرص على نفعه، ويستعين بالله وحده، ويأخذ بالأسباب، فان أصابه بعد ذلك أمر يكرهه، فلا يندم، بل يرضى بما قدره الله، قال الله تعالى: ﴿ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾[149].

واتە/ بەڕاستی ئەو باوەڕدارەی خوای گەورە خۆشی دەوێت ئەو باوەڕدارەیە کە بەهێزە وکاردەکات و هەوڵ دەدات بۆ سود وقازانجی خۆی، وە تەنها داوای یارمەتی لە خوا دەکات، وەدەستیش دەگرێت بە هۆکارەکانەوە، ئەگەر لە دوای ئەوە شتێکی توش بوو کە پـێی ناخۆشـە، پەشـیمان نابێتـەوە، بـەڵکو ڕازی دەبێـت بـە قـەدەری خوا،خـوای گەورە دەفەرمێت:

دوور نیـیە ئێوە شتێکتان پێ ناخۆش بێت لەگەڵ ئەوەیشدا خێرێکی زۆری تێدایە بۆتـان، وە دوور نیـیە شـتێکتان پێ خۆش بێت لەگەڵ ئەوەشدا شەڕو خراپەیەکی زۆری تێدایە بۆتان، جا خـوای گـەورە زانایـە بەشـتە نهێنییـەکان بەڵام ئێوە نایزانن.

# السنة والبدعة

## سوننەت وداهێنراو

س١/ هل في الدين بدعة حسنة؟

ئایا لە دیندا داهێنراوی باش هەیە؟

ج١/ ليس في الدين بدعة حسنة،

لە دیندا داهێنراوی باش نییە، والدليل قول اله تعالى: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾[150].

واتە/ ئەمڕۆ من دینم بۆ تەواو کردوون، وە نیعمەتەکانی خۆم بەسەرتانا ڕژاندووە، وەڕازیـشم بـەوەی ئیسلام ئـایین وبەرنامەتان بێت.

وقالﷺ: ( اياكم ومحدثات الأمور، فان كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار)[151].

واتە/ وریا بن وخۆتان بپارێزن لە شتە داهێنراوەکان، چونکە بەڕاستی هەمووداهێنراوێك لە دیندا بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، وە هەموو گومڕاییەکیش بۆ ناو ئاگرە.

س٢/ ماهي البدعة في الدين؟

بیدعە لە دیندا چییە؟

ج٢/ البدعة في الدين كل ما لم يقم عليه دليل شرعي.

---

149 - ( البقرة / ٢١٦).

150 - ( المائدة / ٣).

151 - ( صحيح رواه النسائي وغيره).

بیدعە لەدیندا بریتی‌یە لە هەر شتێك كە بەڵگەی شەرعی لەسەر نەهاتبێت.

قال الله منكراً على المشركين بدعهم: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ﴾[١٥٢].

واتە/ خوای گەورە ئینكاری لە كاری هاوبەش پەیدا كەرەكان دەكات ودەفەرمێت: ئایا ئەوان چەند شەریك وهاوبەشێكان هەیە جگە لە خوا شتانێكیان بۆ دادەنێن لە دیندا كە خوای گەورە رێگەی پێ نەداوە.

وقال ﷺ: ( من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد)[١٥٣]. (رد: غير مقبول).

واتە/ هەر كەسێك شتێك دابهێنێت لەم دینەی ئێمەدا تیایدا نەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت. ( رد: وەرناگیرێت).

## أنواع البدع الدينية

### جۆرەكانی بیدعە لە دیندا

١- البدعة المكفرة: كدعاء الأموات أو الغائبين والاستعانة بهم، كقولهم: (المدد يا سيدي فلان).

بیدعەی كافر بوون، وەكو پاڕانەوە لە مردووەكان وئەو كەسانەی كە نادیارن وداوای یارمەتی كردن لێیان، وەكو دەڵێن: ( بەهانامەوە وەرە ئەی سەید فلان).

٢- البدعة المحرمة: كالتوسل الى الله بالأموات، والصلاة الى القبور، والبناء عليها.

بیدعەی حەرام: وەكو خۆ نزیك كردنەوە لەخوا بەهۆی مردووەكانەوە، وە نوێژ كردن بەرامبەر گۆڕ، وەخانو كردن لەسەری.

٣- البدعة المكروهة: كصلاة الظهر بعد الجمعة، ورفع الصوت بالصلاة والتسليم بعد الأذان، أما أمور الدنيا كالمخترعات وغيرها فلا تدخل في بدع الدين لقوله ﷺ: ( أنتم أعلم بأمر دنياكم)[١٥٤].

بیدعەی ناڕەوا: وەكوكردنی نوێژی نیوەڕۆ لە دوای جومعەوە، وە دەنگ بەرز كردنەوە لەناو نوێژدا، وەسەلاوات دان لە دوای بانگ، بەلام لە كاروباری دونیادا ئەو شتانەی كە تازە داهێنراون ناچنە ناو بیدعەی دینی‌یەوە چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێوە شارەزا ترن بە كاروباری دونیاكەتان.

س٣/ هل في الاسلام سنة حسنة؟

ئایا لە ئیسلامدا سوننەتی باش هەیە؟

ج٣/ نعم في الاسلام سنة حسنة، ( لها أصل كالصدقة).

بەڵێ لەئیسلامدا سوننەتی باش هەیە، ( بنەمایەكی هەبێت وەكو خێر كردن).

قال ﷺ: ( من سن في الاسلام سنة حسنة فله أجرها، وأجر من عمل بها من بعده، من غير أن ينقص من أجورهم شيء)[١٥٥].

واتە/ هەر كەسێك لە ئیسلامدا سوننەتێكی باش دا بێنێت ئەوا پاداشتی ئەو سوننەتە وەردەگرێت كەزیندووی كردۆتەوە، وە پاداشتی ئەو كەسانەیشی پێ دەگات كە كار بەو سوننەتە دەكەن لە دوای خۆی، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەویش كەم بكاتەوە.

---

152 - ( الشورى / ٢١).

153 - ( متفق عليه).

154 - (رواه مسلم).

155 - (رواه مسلم).

## وكان حقاً علينا نصر المؤمنين

### سەرخستنی باوەڕداران حەقە لەسەرمان.

س٤/ متى ينتصر المسلمون؟

کەی موسڵمانان سەردەکەون؟

ج٤/ ينتصر المسلمون اذا رجعوا الى تطبيق كتاب ربهم، وسنة نبيهمﷺ وأخذوا بنشر التوحيد، وحذروا من الشرك على اختلاف مظاهره، وأعدوا لأعدائهم ما استطاعوا من قوة.

موسڵمانان سەردەکەون ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ جێبەجێ کردنی قورئانەکەی پەروەردگاریان وسوننەتی پێغەمبەرەکەیانﷺ، وەدەست بکەن بە بڵاوکردنەوەی بەتاک دانانی خوای گەورە، وەخەڵکی ئاگادار بکەنەوە لە هاوبەش دانان بۆ خوا بە هەموو جۆر ودیاردەکانیەوە، وە خۆیان ئامادە بکەن بۆ دوژمنەکەیان چەندێك لەتواناییاندا بێت.

١- قال الله تعالى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾[156].

واتە/ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە دینیخوا و یەکخواپەرستی سەرخەن خوای گەورەیش سەرتان دەخات و پێتان دامەزراو دەکات لەکاتی غەزا کردن و لەسەر پردی صراط.

٢- وقال الله تعالى: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا﴾[157].

واتە/ خوای گەورە بەڵێنی داوە بەو باوەڕدارانەی کردەوەی چاك دەکەن جێنیشینیان بکات لەسەر زەوی هەروەکو چۆن ئەوانەی پێشوی جێنیشین کرد، وە ئەو دینەیشیان بۆ جێگیر دەکات کە خوای گەورە لێی ڕازییە، وە ئەو ترس ولەرزەی هەیان بوو بۆیان دەگۆڕێتە ئاسایش و هێمنی، بەمەرجێك خوای گەورە بەتاك و تەنها بپەرستن وهیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی.

٣- وقال الله تعالى: ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾[158].

واتە/ ئامادەی کەن بۆ دوژمنانتان چەندێك لە تواناتاندا هەیە لە کەرەستەکانی شەڕکردن.

٤- وقالﷺ: ( ألا ان القوة الرمي)[159].

واتە/ ئاگادار بن هێز مەبەست پێی تیر هاویشتنە.

**والحمد لله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه أجمعين.**

تەواو بووم لە وەرگێرانی ئەم نامیلکە بەسودە لە ڕۆژی چوار شەمە

بەرواری: ١١/ رجب/ ١٤٢٦ك

بەرامبەر: ٢٠٠٥/٨/١٧ز



156 - ( محمد / ٧).

157 - ( النور / ٥٥).

158 - ( الأنفال / ٦٠).

159 - (رواه مسلم).